پڕۆژەی بەهای فەرموودە







# فەرموودەی پێغەمبەر

صلى الله عليه وسلم



نووسینی
محمد الشيخ طاهر البرزنجي

وەرگێڕانی
سیروان کاکە أحمد






پڕۆژەی بەهای فەرموودە

# ١٥٠
# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

نووسینی

**محمد الشيخ طاهر البرزنجي**

وەرگێڕانی

**ســيروان كاكه أحمــد**

١٤٤١ك - ٢٠٢٠ز

## پێشەکی نووسەر

سوپاس و ستایش بۆ خوا، صەڵات و سەلام بۆ سەر خاوەنی ڕوونکردنەوەی قورئان پێغەمبەرمان موحەممەد، وە بۆ سەر گیانی هاوەڵانی تا ڕۆژی دوایی، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل، خوا لەسەر زمانی گەورەمان ئیبراهیم ؑ، کە لە دوعاکەیدا باسی ئەرکی پێغەمبەری کۆتا زەمان دەکات، فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾﴾ البقرة.

بۆیە سوننەتی ڕاست و دروست ڕوونکردنەوەی قورئانەو حیکمەتە بۆ بڕواداران.

بێگومان پەروەردگارمان ﷻ بەڵێنیداوە قورئان بپارێزێ و، بەهەمان شێوە ڕوونکردنەوەکەشی بپارێزێ لە یەك سوورەتدا وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَـٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾﴾ القيامة، بێگومان مافی یاسادانان بە پێغەمبەر ﷺ بەخشراوە، بۆ هەر شتێك کە بە درێژی و بە وردی لە قورئاندا نەهاتووە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَـٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ ﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف.

لە کۆتایی دا بێگومان خوا ﷻ یەك ڕێگەی دیاری کردووە بۆ ڕزگاربوون لە ڕۆژی دوایی و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، ئەویش دیارە بە پەیڕەوی کردنی پێغەمبەر ﷺ دەبێ، لەوەی حەڵاڵی کردووەو حەرامی کردوە، هەروەها مەنهەج و سوننەتەکانیشی، وەك خوای

بەرز فەرموویەتی: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ ﴿٦﴾﴾ الممتحنة.

به درێژایی چوارده سەده خوا کۆمەڵێك له زانایانی موفق کردوه له خزمەتی سوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ، هەم له ڕووی گێڕانەوەو، هەم له ڕووی بەدواداچوون و تێگەیشتن، خوای بەرز پاداشتی زۆریان بداتەوە، خوا شەرەفمەندی کردم به بەدواداچوونی فەرموودەو زانستەکانی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەسەر دەستی زانایانی پایه بەرز له هەموو وڵاته ئیسلامیه جیاوازەکان، خوا سەربەرزی کردم به دانانی ئەم کتێبه بچوکە، که پوختەیەك له فەرموودەکانم تێیدا کۆکردۆتەوە، دەربارەی بڕواو ئەحکامەکان و خوڕەوشته بەرزەکان، لەوەی فێری بووم له زانستی فیقهـ و تەفسیر، وه ئەوەی وەرمگرتووه له فەرموودەکان له زانایانی پایەبەرزمەوە، به تایبەت: (شيخي العلامَة المحقق محمد صُبْحي حَسَن حَلأق رَحِمَهُ الله، وَشيخي العلامَة طاهر البرزنجي رَحِمَهُ الله، وقاضي القضاة العلامة محمد بن إسماعيل رَحِمَهُ الله، وأخي الشيخ المحقق عقيل المقطري حفظه الله)ە، هەروەها سەرجەم زانایانی پایه بەرزیش.

بێگومان بۆ هەر دەروازەیەك ئەوەی مەبەست بووه هەڵمبژاردووە، ئومێدەوارم به پشتیوانی خوا نزیکم کردبێتەوەو ڕاستیەکانم پێکابێ، بێگومان هەوڵی تەواوم داوه ئەو وشانەی له فەرموودەکەدا قورسن لەکاتی پێویست شی بکەمەوە، وه زۆرێکیش له شیکردنەوەکانم بەجێهێشتوون، به هۆی کۆمەڵه فەرموودەیەك که لای خوێنەران ڕوونه، زانایانیش به تێرو تەسەلی شیانکردۆتەوە به تایبەت له کتێبی (عمدة الأحكام) و، جگه لەویش له کتێبه به پێزەکانی دیکە، پاشان من درێژەمداوه به هەندێ شت که پەیوەسته به مافەکانی مرۆڤ و

ژیانی خێزان و مامەڵەکردنی ئاشتیانە لە نێوان خەڵك و جێبەجێ کردنی دادگەری لە نێوانیاندا، وە بە فەرموودەی نیازو مەبەست دەستم پێکردوە، وەك شوێنکەوتنی پێشەوا بوخاریی و زانایانی دیکە ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، جا ئەگەر لێکدانەوەو هەڵهێنجانم بۆ دەقەکان ڕاست و دروست بێ، بە تەوفیقی خوایە، وە ئەگەر هەڵە بێ ئەوە لە منەوەیەو داوای لێخۆشبوون دەکەم.

بێگومان برازاکەم مامۆستا (نهاد جلال) دیزاینی ڕێکخستووە، هەروەها مامۆستا (سیروان کاکە ئەحمەد) هەڵساوە بە وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی و، فەرموودەکانی شیکردۆتەوە، هەروەها چەند جارێکیش لەگەڵ مندا دووبارەی کردۆتەوە، وە مامۆستا (مروان الكردي)یش هەڵساوە بە پێداچوونەوەی نصوصە عەڕەبیەکە، خوای گەورە ئەو کردەوەیە بخاتە سەر پاداشتی چاکەکانیان و، چاکەی مامۆستاکانیان، ئامین.

**محمد الشيخ طاهر البرزنجي**

٦/ جماد الأول/ (١٤٤١)ی هـ

١/ كانون الثاني/ (٢٠٢٠)ی م.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

رَبِّ يَسِّرْ أَعِن، يَا كَرِيم

## پێشەکی وەرگێڕ

ستایشی شایسته بۆ خوای باڵادەست، صەڵات و سەلام له سەر خۆشەویست و پێشەوامان موحەممەد ﷺ، ئەم نووسراوه بریتیه له کۆکردنەوەی کۆمەڵێك فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ له بوارەکانی: (ئیمان و ئەحکام و ڕەوشته بەرزەکان) که لەسەر داوای بەنده، زانای پایەبەرز (د. محمد الشيخ طاهر البرزنجي) بۆ قۆناغی پێنجەمی پڕۆژەی (بەهای فەرمووده) ئامادەی کردوەو، دەکرێ بکرێته مەنهەج له قوتابخانه شەرعیەکان و حوجرەکان، سوودی لێ ببینرێ.

سوپاسی خوا دەکەم، که مۆڵەتی ئەوەی پێدام بتوانم له خزمەتی ئەم کتێبه به پێزه دابم، که بریتیه له دوڕو مرواری و گەوهەر، له فەرمووده موبارەکەکانی خۆشەویستمان ﷺ، به وەرگێڕان و شەرح کردنی بەشێك له فەرمووودەکان و، ڕوونکردنەوەی هەندێك وشەی قورس، دیاره ئەمەش به هاوکاری هەم خودی نووسەری بەڕێز، وه هەم ئەو مامۆستاو خوشك و برایانەم، که هاوکارم بوون له پێداچوونەوەو پێشنیار بۆ کردن و هەڵه بۆ چاککردنەوەم و ... هتد، خوای بەرز به باشترین شێوه پاداشتیان بداتەوە.

داواکارم لە خوای میهرەبان، بیکاتە چرایەك بۆ ڕێنمایی خۆمان و موسڵمانان لە دونیاو، توێشوویەك بێ بۆ قیامەتمان... اللّٰەم أمین.

سیروان کاکە أحمد

هەولێر - ٢٠٢٠/١/١

## پێگەی سوننەت لە ئیسلامدا

گومان لەوەدا نیە کە ناحەزان و تێنەگەیشتووان لە ئیسلام بە جۆرەها شێوە دێن گومان لەسەر ئیسلام دروست دەکەن و دەیانەوێ بە فووی دەمیان ڕووناکی خۆری ئیسلام بکوژێننەوە، ئەم کارەشیان بەردەوامە، یەکێك لە کارەکانیان بریتیە لە هەوڵدان بۆ ڕەت کردنەوەی سوننەت بە گشتی، وە دەڵێن: قورئان بە تەنیا کافیەو پێویستمان بە حەدیس نیە، مەبەستیش لەم بانگەشە پیسە لە ناوبردنی شەریعەتی ئیسلامە، چونکە دیارە سوننەت چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئانە، بۆیە تانەدان لە سوننەت، تانەدانە لە قورئان، ئا ئەم بانگەشە پووچە لە کۆتایی جیلی زێرینی هاوەڵان سەری هەڵدا، وردە وردە تەشەنەی کرد تا دواتر گەیشتە ئەم نەوەی ئێستا.

ئیتر بەردەوام زانایان بەرپەرچی گومانەکانیان داونەوە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا، وە ئێمە هەر زۆر بە کورتی ئاماژە بە چەند بەڵگەیەك دەکەین کە گەورەیی و پێگەی سوننەتمان بۆ دەردەخەن، بۆ هەر کەسێك کە خوا ڕێنمایی بکات و خۆشی بە دوای هەقدا بگەڕێ.

دەڵێین: سوننەتی پاکی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانی موعتەبەری لەسەرە کە بە بەڵگە دەهێنرێتەوە، سوننەت هەم وەك چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئان بە بەڵگە دەهێنرێتەوە، هەم وەك خۆی کە بۆ حوکمێکی سەربەخۆ گوتراوە، وە چەندین بەڵگە لە قورئان هەن فەرمان دەکەن بە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺو، شوێنکەوتنی سوننەت، وە بە پێچەوانەوە هەڕەشەو وریاکردنەوەی زۆر هەن بۆ ئەوانەی پێچەوانەی سوننەت هەڵسوکەوت دەکەن، با سەرنجی چەند دەقێك بدەین:

دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴿٣١﴾ ﴾آل عمران، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خوای پەروەردگاریش خۆشتانی دەوێ.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴿٨٠﴾ ﴾النساء، ئا لێرەدا خوای پەروەردگار گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری ﷺ بە گوێڕایەڵی خۆی داناوە.

دوا ئایەت ئەوەیە کە خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونی فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴿٧﴾ ﴾الحشر، واتە: هەر شتێك لە فەرمان کە پێغەمبەر بۆتانی دێنێ و پێتان دەڵێ وەری بگرن و جێبەجێی بکەن، وە کە قەدەغەشتان دەکات لە هەر شتێك، وازی لێ بێنن و ئەنجامی نەدەن.

کە هیچ گومان لەوەدا نیە، ئەم دەقە هەم وەرگرتنی قوڕئان و هەم وەرگرتنی فەرمووده دەگرێتەوە.

لە ڕاستیدا بەبێ سوننەت هیچ کەسێك ناتوانێ دینداری بکات، ئێمە وەك مسوڵمانان ڕۆژانە پێویستیمان بە فەرمووده شیرینەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، تا لە کاروباری ژیانی ڕۆژانەمان بە کاریان بێنین و بە پێی ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەفتار بکەین.

پەرتووكی:

# ئیمان و بەشەكانی (كردەوەی دڵ، كردەوەی زمان، كردەوەی ئەندامەكانی جەستە)[1]



---

(١) كتاب الإيمان وشعبه، (عمل القلب، عمل اللسان، عمل الجوارح)، النية مفتاح الأعمال).

## نیاز و مەبەستەکان کلیلی کردەوەکانن

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ١١ ﴾الزمر.

واتە: بڵێ: من فەرمانم پێکراوە، بەندایەتی بۆ خوا بکەم بەدڵسۆزیەوە بۆی ملکەچ بم.

١- {عن عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»}[1].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لەسەر مینبەر گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: بێگومان (قبووڵ بوونی) کردەوەکان بە پێی نیازەکانە، وە هەموو کەسێك بە پێی نیازەکەی پاداشت دەدرێتەوە، جا هەر کەس کۆچ کردنی بۆ بەدەستهێنانی (دەستکەوتیکی) دونیایی بێ، یان بۆ مارەکردنی ئافرەتێك بێ، ئەوە کۆچ کردنەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆ کردوە. (مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە کە نیازو مەبەست بنچینەو بنەمای هەموو کارێکە).

---

(١) (صحيح البخاري ح١)، (صحيح مسلم ح٤٩٠٤).

## چەند نموونەیەك دەربارەی بەشەکانی ئیمان[١] ئەوانەی پەیوەستن بە دڵ و وتە و کردەوەکان

٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الإِيْمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ، أَوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ، شُعْبَةً، فأَفْضَلُهَا قَوْلُ لاَ إِلَهَ إلاُ اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیمان حەفتاو ئەوەندە، یان شەست و ئەوەندە بەشەیە، باشترینیان (گوتنی وشەی:) هیچ پەرستراوێك نیە (بە هەق) جگە لە خوا، وە کەمترینی لابردنی هەر شتێکە لە ڕێگەی خەڵك، کە ئەزیەتیان بدات، وە حەیا بەشێکە لە ئیمان.**

## حەزکردن بە چاکەی خەڵك لە بەشەکانی ئیمانە[٣]

٣- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»}[٤].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێك لە ئێوە ئیمانی تەواو نیە، تاکو چی بۆ خۆی پێ خۆشە، بۆ برا (و خوشکی مسوڵمانیشی) پێ خۆش نەبێ.**

---

(١) أمثلة على شعب الإيمان، القلبية والقولية والعملية.

(٢) (صحيح مسلم ح١٥١).

(٣) حب الخير للناس من شعب الإيمان.

(٤) (صحيح البخاري ح١٣واللفظ له)، (صحيح مسلم١٦٨).

## خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ لە تەواوی ئیمانە[١]

٤- {عَنْ أَنَسٍ ﵁، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ، وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ»}[٢].

**واتە: ئەنەس ﵁، دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەكێك لە ئێوە ئیمانی تەواو نیە، هەتا منی لە باوك و دایك و منداڵەكانی و هەموو خەڵك خۆشتر نەوێ.**

## خۆشویستنی هاوەڵان لە بەشەكانی ئیمانە[٣]

٥- {عَنْ أَنَسٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «آيَةُ الإِيمَانِ حُبُّ الأَنْصَارِ، وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الأَنْصَارِ»}[٤].

**واتە: ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویستی ئەنصار نیشانەی ئیمانە، ڕق لێبوونەوەی ئەنصار نیشانەی دووڕوویيە.**

---

(١) حب الرسول محمد ﷺ من كمال الإيمان

(٢) (صحيح البخاري ١٥ واللفظ له)، (صحيح مسلم ح ١٦٦).

(٣) حب الصحابة من شعب الإيمان

(٤) (صحيح البخاري ح١٧ واللفظ له)، (صحيح مسلم ح٢٣٢).

## فراوانی بەزەیی خواو جیاوازی پلەکانی ئیمان[1]

٦- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَيُخْرَجُونَ مِنْهَا قَدِ اسْوَدُّوا، فَيُلْقَوْنَ فِي نَهر الْحَيَا، أَوِ الْحَيَاةِ، شَكَّ مَالِكٌ، فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي جَانِبِ السَّيْلِ، أَلَمْ تَرَ أَنَّهَا تَخْرُجُ صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً»}[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشت، دۆزەخیەکانیش دەچنە دۆزەخ، پاشان خوای زاڵی پایەدار پێیان دەفەرموێ: هەر کەسێك بە ئەندازەی تۆزقاڵێك لە خەرتەل ئیمانی لە دڵ دا هەیە دەریانبێنن، کە دەردەهێنرێن ڕەش هەڵگەڕاون، دەخرێنە نێو ڕووباری ژیان، دەڕوێنەوە هەروەك چۆن دەنکە تۆوێك لە تەنیشت ئاوێکدا دەڕوێت، ئایا نەتبینیوە ئەم دەنکە چۆن چەکەرە دەکات بە ڕەنگی زەردەوە ملی خوار کردۆتەوە.

## ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان لە بەشەکانی ئیمانە[3]

خوا دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾﴾ البقرة.

---

(١) سعة رحمة الله وتفاوت درجات الإيمان

(٢) (صحيح البخاري ح ٢٢ واللفظ له)، (صحيح مسلم ح ٤٥٦).

(٣) صيام رمضان من شعب الإيمان، وقوله تعالى: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾﴾ البقرة.

واتە: ڕۆژووتان لەسەر فەرز کراوە، وەك چۆن لەســەر ئەوانەی پێش ئێوەش فەرز کرابوو، بەڵکو پارێز بکەن.

٧- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانَاً وَاحْتِسَابَاً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»}[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ و، بڕوای پێی هەبێ و، چاوەڕوانی پاداشت بێ، خوا لە گوناهەکانی پێشووی دەبورێ.

## چاکە کردن لەگەڵ دراوسێ و ڕێزگرتن لە میوان و نەگوتنی قسەی خراپ لە بەشەکانی ئیمانە[٢]

٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ»}[٣]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با دراوسێکەی ئەزیەت نەدات، هەرکەسێك بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانی بگرێ، وە هەر کەسێك بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاك بکات، یان بێ دەنگ بێ.

---

(١) (صحيح البخاري ح ٣٨ واللفظ له) (صحيح مسلم ح ١٧٥ فقد جمع بين الصيام والقيام برواية واحدة).

(٢) من شعب الإيمان بر الجار وإكرام الضيف وقول الخير والسكوت عن قول الشر.

(٣) (صحيح البخاري ح ٦٠١٨)، (صحيح مسلم ح ١٧٢ ولفظه فليكرم جاره).

## ئازاردانی دراوسێ لە ناتەواوی ئیمانە[1]

٩- {عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، قِيلَ: وَمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الَّذِي لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَايِقَهُ»}[2].

**واتە: ئەبو شورەیح ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە خوا ئیمان ناهێنێ، بە خوا ئیمان ناهێنێ، بە خوا ئیمان ناهێنێ، گوترا: کێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە دراوسێیەکەی لە زیان و زەرەری دڵنیا نیە.**

## ئاسانکاری لەسەر خەڵك لە ئاینەکەیان و، خۆ دوورگرتن لە توندی[3]

١٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلاَّ غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا، وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، وَاسْتَعِينُوا بِالْغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ وَشَيْءٍ مِنَ الدُّلْجَةِ»}[4].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئاین ئاسانە، هەرکەسێك لەسەری قورس بکات، ئەوە دین بەسەریدا زاڵ**

---

(١) إيذاء الجار من نقص الإيمان

(٢) أخرجه البخاري في كتاب الأدب باب إثم من لا يأمن جاره بوائقه ح ٦٠١٦).

(٣) التيسير على الناس في امور دينهم والابتعاد عن التشدد، وقوله تعالى: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾البقرة، وقوله تعالى: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقرة.

(٤) (صحيح البخاري ح٣٩ ).

دەبێ، دەست بەوە بگرن، کە ڕاستە (بەبێ زێدەڕۆیی)، نزیك ببنەوە، مژدە بدەن، ئاسانکاربن، بە بەیانیان و ئێواران پەرستش ئەنجام بدەن، وە بەشێکی نیوەی شەویش).

ڕووداوی ئەم فەرموودە:

یەکێك لە هاوەڵان داوای کرد لە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێبدات هەموو ڕۆژێك ڕۆژوو بگرێ، لەو کاتە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئەم فەرموودەی پێ فەرموو، ئنجا کە ئەم هاوەڵە بەتەمەندا چوو، بینی وەك جاران توانای نییە ڕۆژووەکان بگرێ، کە لە سێ ڕۆژان ڕۆژێك بە ڕۆژوو دەبوو.

# پەرتووکی :

# پاك و خاوێنی و دەستنوێژ[1]

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ٢٢٢﴾ البقرة.

واتە: بێگومان خوا تەوبەکارانی خۆشدەوێ و، خۆپاککەرەوانی خۆشدەوێ.



(١) كتاب الطهارة الوضوء، وقوله تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ٢٢٢﴾.

١١- {عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْحَارِثِ بْنِ عَاصِمٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ "الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَآنِ -أَوْ: تَمْلَأُ- مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَك أَوْ عَلَيْك، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَايِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا}[١].

**واتە: ئەبو مالیکی ئەشعەریی ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پاك و خاوێنی بەشێکی ئیمانە، (الْحَمْدُ للهِ) تەرازوو پڕ دەکات، (وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ) نێوانی ئاسمانەکان و زەوی پڕ دەکەن، نوێژ ڕووناکییە، خێرو چاکەکردن بەڵگەی (ملکەچییە بۆ خوا)، ئارامگرتن ڕووناکییە، قورئانیش بەڵگەیە بۆت، یان لەسەرت، خەڵکی هەموو بەیانیان زوو دەڕۆن خۆیان دەفرۆشن و خۆیان ڕزگار دەکەن (بەگوێڕایەڵی خوای گەورە)، یاخود خۆیان لە نێو دەبەن (بە سەرپێچی خوای گەورە).**

١٢- {عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، قَالَ: «سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ»}[٢].

**واتە: عەبدولعەزیزی کوڕی صوهەیب، دەڵێ: گوێم لە ئەنەس ﷺ بوو دەیگوت: هەر کاتێك پێغەمبەر ﷺ بیویستایە بچێتە سەرئاو دەیفەرموو: خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە جنۆکەی نێرو مێ.**

---

(١) صحيح مسلم باب فضل الوضوء، ح ٢٢٣.

(٢) (صحيح البخاري ح١٤٣).

## دەستپێکردن بە لای ڕاست لە دەستنوێژ و هەرکارێکی دی سوننەتە[١]

١٣- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ، وَتَرَجُّلِهِ، وَطُهُورِهِ، وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ»}[٢].

واتە: (دایکی بڕواداران) عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زۆری پێخۆش بوو بە لای ڕاستی دەست پێبکات کە نەعلی لەپێ دەکرد، کە قژی دادەهێنا، کە دەستنوێژی دەگرت، یان کە خۆی دەشۆرد، وە لە هەموو کاروبارێکیدا.

## شۆردنی ئەندامەکان لە دەستنوێژدا دروستە جارێك، یان دووجار، یان سێ جار بێ[٣]

١٤- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: تَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ «مَرَّةً مَرَّةً»}[٤].

واتە: ئیبنو عەباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ، دەستنوێژی گرت یەکجار یەکجار.

---

(١) البدء باليمين في الوضوء وغيره سنة.

(٢) (صحيح البخاري ح ١٦٨).

(٣) غسل الأعضاء في الوضوء يصح مرة ومرتين وثلاثا.

(٤) (صحيح البخاري ح ١٥٨).

## چۆنێتی دەست نوێژ گرتن بە تێرو تەسەلی[١]

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ ٦﴾ المائدة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کات بۆ نوێـژ هەڵســـان، ڕووتان بشۆن، وە هەردووك دەستیشتان هەتا ئانیشکان، وە دەسـتی تەڕ بەسەرتاندا بێنن، وە لاقەکانیشتان بشۆرن هەتا دوو گوێزینگەکان.

١٥- {عَنْ حُمْرَانَ مَوْلَى عُثْمَانَ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ رَأَى عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ دَعَا بِإِنَاءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى كَفَّيْهِ ثَلاَثَ مِرَارٍ فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الإِنَاءِ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثَلاَثَ مِرَارٍ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلاَثَ مِرَارٍ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»}[٢].

واتە: حومران خزمەتکاری مەولای عوسمان ؓ دەگێڕێتەوە، کە ئەو عوسمانی کوڕی عەففانی بینی، داوای قاپێکی کرد، سێ جار بە قاپەکە ئاوی بە دەستیدا کرد و شۆردی، پاشان دەستی ڕاستی خستە نێو قاپەکەو شۆردی، ئاوی لە دەم و لووتی وەردا، پاشان سێ جار ڕوخساری شۆرد،

---

(١) تفصيل كيفية الوضوء، قوله تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ ٦﴾ المائدة.

(٢) (صحيح البخاري ح ١٥٩).

پاشان سێ جار دەستی شۆرد تا ئەنیشکەکانی، پاشان مەسحی سەری کرد، دوایی سێ جار قاچی تا گوێزینگی شۆرد، ئنجا گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێ وەك ئەم دەستنوێژەی من، پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات، خۆی سەرقاڵ نەکات بە شتی دیکە تێیدا، ئەوە خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێ.

## دەستنوێژ گرتن مەرجێکە لە مەرجەکانی نوێژ[1]

١٦- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَلاةَ أَحَدِكُمْ إِذَا أَحْدَثَ، حَتَّى يَتَوَضَّأَ»}[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا نوێژی هیچ یەکێکتان وەرناگرێ، ئەگەر دەستنوێژی نەما، تاکو دەستنوێژ دەگرێتەوە.

## ئەو شتانەی دەستنوێژ دەشکێنن[3]

١٧- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، الرَّجُلُ الَّذِي يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلاَةِ، فَقَالَ: «لاَ يَنْفَتِلْ أَوْ لاَ يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً أَوْ يَجِدَ رِيْحاً»}[4].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پیاوێك کە هەست بە شتێك

---

(١) الوضوء شرط من شروط للصلاة.

(٢) (صحيح البخاري ح ٦٩٥٤).

(٣) من نواقض الوضوء.

(٤) (صحيح البخاري ح ١٣٧).

بکات لە نێو نوێژەکەیدا (وەك ئەوەی دەستنوێژی شکاوە)، فەرمووی: با نوێژەکەی نەبڕێ تا دەنگێك دەبیستێ، یان بۆنی بایەك دەکات.

١٨ - {عَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً، فَأَمَرْتُ اَلْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ أَنْ يَسْأَلَ اَلنَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَهُ؟ فَقَالَ: «فِيهِ اَلْوُضُوءُ»}[١].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: من پیاوێك بووم مەزیم زۆر بوو، بە میقدادی کوڕی ئەسوەدم گوت: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ بکات، ئەویش پرسیاری لێکرد (ئەگەر کەسێك وابێ؟)، فەرمووی: پێویستە دەستنوێژ بگرێ.

### میزی ئەو منداڵەی کە خواردن ناخوات[٢] پێویست ناکات شوێن میزەکە بشۆردرێ بەڵکو ئاوپرژێن دەکرێ

١٩ - {عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ الأَسَدِيَّةِ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا: أَنَّهَا أَتَتْ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ، لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ، إِلَى رَسُولِ اللّهِ ﷺ، فَأَجْلَسَهُ فِي حَجْرِهِ، فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ، فَنَضَحَهُ عَلَى ثَوْبِهِ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ}[٣].

واتە: دایکی قەیسی کچی میحصەنی ئەسەدی (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو منداڵێکی شیرەخۆری هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی نەدەخوارد، (پێغەمبەر ﷺ) لە باوەشی خۆیدا داینیشاند، منداڵەکەش میزی بە کۆش (باوەش)ی دا کرد، (پێغەمبەر ﷺ) داوای کرد ئاوی بۆ بێنن، ئاوەکەی پرژاند بەسەر پۆشاکەکەی و، نەیشۆری.

---

(١) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ ح ١٣٢.

(٢) بول الرضيع الذي لا ياكل الطعام، لا يستوجب الغسل بل النضح.

(٣) (صحيح البخاري ح ٢٢٣).

## پاككردنەوەی ددانەكان
## یەكێكە لە سوننەتەكانی پێش نوێژ[١]

فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (سیواك كردن مایەی ڕەزامەندی خـوایە و، پاككەرەوەی دەم و ددانە) [٢]

٢٠ - {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي أَوْ عَلَى النَّاسِ، لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلَاةٍ»}[٣].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر قورس نەبووایە لەسەر ئۆممەتەكەم، یان لەسەر خەڵك، فەرمانم پێدەكردن لەگەڵ هەموو نوێژێك سیواك بكەن.

## یەكێك لە مەرجەكانی مەسح كردن لەسەر خوفەكان دەستنوێژ گرتنە پێش لە پێ كردنیان[٤]

٢١- {عَنِ الْمُغِيرَةِ، بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأَهوَيتُ لِأَنزِعَ خُفَّيهِ، فَقَالَ: «دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدخَلتُهُمَا طَاهِرَتَينِ فَمَسَحَ عَلَيهِمَا»}[٥].

---

(١) تنظيف الاسنان من السنن قبل الصلاة، وقوله عليه الصلاة والسلام (السواك مرضاة للرب مطهرة للفم).

(٢) (صححه النووي في المجموع /١٢٦٧).

(٣) (صحيح البخاري كتاب الجمعة باب السواك يوم الجمعة، ح ٨٨٧).

(٤) من شروط المسح على الخفين الوضوء قبل لبسهما.

(٥) (صحيح البخاري ح٢٠٣).

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷛ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە سەفەرێکدا، خۆم شۆڕ کردەوە تا خوفەکانی لەپێ بکەمەوە (تا پێیەکانی بشوات)، فەرمووی: وازیان لێ بێنە، بە دەستنوێژەوە لە پێم کردوون، ئنجا مەسحی لەسەر هەردووکیان کرد.

## فەزڵی نوێژی بە کۆمەڵ[1]

٢٢ - {عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صَلاَةُ الْجَمَاعَةِ أَفضَلُ مِنْ صَلاَةِ الفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»}[2].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی بە کۆمەڵ بیست و حەوت پلە چاکترە لە نوێژی بە تەنیا.

## ماوەی مەسح کردن لەسەر خوفەکان لە سەفەر و نیشتەجێ بوون[3]

٢٣ - {عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِيءِ ﷛ قَالَ أَتَيْتُ عَائِشَةَ أَسْأَلُهَا عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَتْ: عَلَيْكَ بِابْنِ أَبِي طَالِبٍ فَسَلْهُ، فَإِنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ، وَيَوْمًا وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ}[4].

---

(١) فضل صلاة الجماعة.

(٢) (صحيح البخاري ح ٦٤٥).

(٣) مدة المسح على الخفين في السفر والحضر.

(٤) صحيح مسلم باب التوقيت في المسح على الخفين، ح ٢٧٦.

واتە: شورەیحی کوڕی هانیئ دەڵێ: چووم بۆ لای عائیشە بۆ پرسیار کردن دەربارەی مەسح کردن لەسەر خوفەکان، گوتی: بڕۆ بۆ لای عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب پرسیاری لێ بکە، چونکە ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتی دەکرد، ئێمەش پرسیارمان لێکرد دەربارەی مەسح کردن، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دایناوە، ئەوەی گەشتیارە سێ ڕۆژو شەوەکانیشی (مەسح بکات)، ئەوەشی دانیشتووە (واتە: لە سەفەر نیە) شەوو ڕۆژێك مەسح بکات.

## سوننەتەکانی فیطرەت[1]

٢٤ - {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اللّهِ ﷺ قَالَ: «عَشْرَةٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَقَصُّ الأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَالإِسْتِنْشَاقُ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ»، قَالَ مُصْعَبٌ: «أحد الرواة السند» وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ}[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دە شت هەن لە سروشتی مرۆڤن: سمێڵ کورتکردن، کورتکردنی نینۆکەکان، شۆردنی ئەو شوێنانەی کە پیسی تێدا کۆدەبنەوە، ڕیش هێشتنەوە، بەکارهێنانی سیواك، ئاو لە لووت وەردان، هەڵکەندنی مووی بنباڵ، لابردنی مووی پێش و پاش، خۆشۆردن بە ئاو، موصعەب (کە یەکێکە لە زنجیرەی ڕاویەکان دەڵێ): دەیەمم بیرچوو، وادەزانم ئاو لە دەم وەردانە).

---

(١) سنن الفطرة.

(٢) (صحيح مسلم ح ٢٦١ والنسائي في سننهِ ٥٠٤٠ وَاللَّفظُ لَهُ).

## فەزڵ و چاکەی نوێژی بەیانی[1]

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ ﴾الإسراء.

واتە: لە کاتی لادانی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمانەوە، تاکو تاریکایی شەو، نوێژ بەرپا بکە و، قوڕئان خوێندنی (نوێژی) بەیانیش گرنگی پێ بدە، بە دڵنیایی قوڕئان خوێندنی بەیانی بینراوو لەلا ئامادە بووە (واتە: فریشتەکان ئامادەی دەبن).

٢٥ - {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَجْتَمِعُ مَلاَئِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ»، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ ﴾}[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکانی شەوو فریشتەکانی ڕۆژ لە کاتی نوێژی بەیانی کۆدەبنەوە، پاشان ئەبو هورەیرە گوتی: (ئەوە) بخوێننەوە ئەگەر دەتانەوێ:

﴿ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ ﴾.

---

(١) فضل صلاة الفجر، وقوله تعالى: ﴿ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ ﴾الإسراء.

(٢) صحيح البخاري في كتاب الأذان: باب فضل صلاة الفجر في جماعة، ح ٦٤٨.

## کۆتا کاتی هەردوو نوێژی بەیانی و عەسر[١]

٢٦ - {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً قَبْلِ أَنْ تَطْلُعَ اَلشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَ اَلصُّبْحَ، وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ اَلْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ اَلشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَ اَلْعَصْرَ»}[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بە ڕکاتێك بگات لە نوێژی بەیانی پێش ئەوەی خۆر هەڵهاتبێ ئەوە بە نوێژی بەیانی گەیشتووە، وە هەرکەسێك بە ڕکاتێك بگات لە نوێژی عەسر پێش خۆرئاوابوون، ئەوە بە نوێژی عەسر گەیشتووە.

## ئەو کاتانەی نوێژ کردن تێیاندا باش نیە[٣]

٢٧ - {عَنْ أَبِـي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلاَتَيْنِ: بَعْدَ الفَجْـرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْـدَ العَصْـرِ حَتَّى تَغْـرُبَ الشَّمْسُ}[٤].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە نوێژ کردن لە دوو کات: لە دوای نوێژی بەیانی تا خۆرهەڵدێ، وە لە دوای نوێژی عەسر هەتا خۆرئاوا دەبێ.

---

(١) آخر وقت صلاتي الفجر والعصر.

(٢) صحيح البخاري كتاب الصلاة ح ٥٧٩.

(٣) الأوقات التي تكره فيها الصلاة.

(٤) صحيح البخاري كتاب موقيت الصلاة ح ٥٨٨.

## مسوڵمان زیندوو بێ، یان مردوو، پاکە[1]

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾﴾ الإسراء.

واتە: بێگومان ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم ناوە.

٢٨ - {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ لَقِيَهُ النَّبِيُّ ﷺ فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ، وَهُوَ جُنُبٌ فَانْسَلَّ فَذَهَبَ فَاغْتَسَلَ، فَتَفَقَّدَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَلَمَّا جَاءَهُ، قَالَ: «أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ»؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَقِيتَنِي وَأَنَا جُنُبٌ فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ حَتَّى أَغْتَسِلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سُبْحَانَ اللَّهِ، إِنَّ الْمُؤْمِنَ لاَ يَنْجُسُ»}[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی گەیشتووە لە ڕێگایەك لە ڕێگاکانی مەدینە، لەو کاتەدا لەشی گران بوو، خۆی لێ شاردەوە، چوو خۆی شۆرد، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پرسی، کاتێك گەڕایەوە بۆ لای گوتی: لە کوێ بووی ئەی ئەبا هورەیرە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەی پێمگەیشتی من لەشم گرانبوو، پێم خۆش نەبوو لە خزمەتتدا دابنیشم تا خۆم نەشۆم. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پاك و بێگەردی بۆ خوا، بەڕاستی مسوڵمان پیس نابێ.

---

(١) طهارة المسلم حيا وميتا، وقوله تعالى: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾﴾ الإسراء.

(٢) (صحيح مسلم كتاب الحيض ح ٣٧١).

## چۆنیەتی دەرکردنی لەشگرانی و، دەستگرتن بەئەندازەی ئەو ئاوەی بەکاردەهێنری[١]

خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُوا۟... ﴿٦﴾ ﴾المائدة.

واتە: وە ئەگەر لەش گران بوون، خۆتان پاك بكەنەوە (بە هۆی خۆ شۆردنەوە).

٢٩ - {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ غَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاةِ، ثُمَّ اغْتَسَلَ، ثُمَّ يُخَلِّلُ بِيَدَيْهِ شَعْرَهُ، حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنَّهُ قَدْ أَرْوَى بَشَرَتَهُ، أَفَاضَ عَلَيْهِ الْمَاءَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ}[٢]

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێك خۆی شۆردبایە لە لەشگرانی، (سەرەتا) هەردوو دەستی دەشۆرد، پاشان دەستنوێژی دەگرت، وەك چۆن دەستنوێژی دەگرت بۆ نوێژ، پاشان خۆی دەشۆرد، ئنجا دەستی دەخستنە نێو پرچی تا دڵنیا دەبوو پێستەکەی تەڕ بووە، دوایی سێ جاران ئاوی پێدادەکرد، پاشان هەموو لاشەی دەشۆرد.

---

(١) كيفية الغسل من الجنابة ، والاقتصاد في قدر الماء المستخدم وقوله تعالى: ﴿ ...وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُوا۟... ﴿٦﴾ ﴾المائدة.

(٢) (صحيح البخاري ح ٢٧٢).

## تەیەموم کردن بۆ کەسی لەشگران لە کاتی نەبوونی ئاو[1]

خــوا دەفــەرموێ: ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُ ٦﴾ المائدة.

**واتە: ئاویشتان چنگ نەکەوت، ئەوە ڕوو بکەنە ڕووی پاکی زەوی و پاش دەستپێداهێنانی، دەست بە ڕووتان و دەستەکانتاندا بێنن.**

٣٠ - {عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَعَثَنِي ٱلنَّبِيُّ ﷺ فِي حَاجَةٍ، فَأَجْنَبْتُ، فَلَمْ أَجِدِ ٱلْمَاءَ، فَتَمَرَّغْتُ فِي ٱلصَّعِيدِ كَمَا تَمَرَّغُ ٱلدَّابَّةُ، ثُمَّ أَتَيْتُ ٱلنَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْكَ هَكَذَا»، ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ ٱلْأَرْضَ ضَرْبَةً وَاحِدَةً، ثُمَّ مَسَحَ ٱلشِّمَالَ عَلَى ٱلْيَمِينِ، وَظَاهِرَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ}[2].

**واتە: عەممارى کوڕی یاسر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ناردمی بۆ پێداویستیەك، لەشگران بووم و، ئاویشم دەست نەکەوت، خۆم لە خۆڵ گەوزاند، وەك چۆن ئاژەڵ خۆی لە خۆڵ دەگەوزێنێ، پاشان چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی: ئەوەندەت بەس بوو، کە ئاوا بکەی، (پێغەمبەری خوا ﷺ) یەك جار لەپی دەستی بە زەوی دادا، فووی لێکرد بە دەم و چاوو پشتی دەستیدا هێنا.**

---

(١) التيمم للجنب عند فقدان الماء، وقوله تعالى: ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُ ٦﴾ المائدة.

(٢) (صحيح البخاري ح ٣٤٧)، (صحيح مسلم ح ٣٦٨) وَهذا اللَّفظُ لِمُسْلِم.

## سوڕی مانگانەو خوێنی ئیستحاضە(١)

٣١ - {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ، سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ فَلا أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلاةَ؟ قَالَ: «لاَ، إِنَّ ذَلِكَ عِرْقٌ، وَلَكِنْ دَعِي الصَّلاةَ قَدْرَ الأَيَّامِ الَّتِي كُنْتِ تَحِيضِينَ فِيهَا، ثُمَّ اغْتَسِلِي وَصَلِّي»}(٢)

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش (خوا لێی ڕازی بێ) پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ، گوتی: من خوێنی (نەخۆشیم) هەیە پاك نابمەوە، ئایا واز لە ئەنجامدانی نوێژ بێنم؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: نەخێر، ئەمە دەمارێکە، تەنیا بە ئەندازەی ئەوەندە ڕۆژە واز لە ئەنجامدانی نوێژ بێنە کە تێیدا دەکەویە سووڕی مانگانەوە، پاشان خۆت بشۆرەو نوێژ ئەنجامبدە.

## مسوڵمان پیس نابێ، پیاوی لەشگران و ئافرەتی حەیزدار پیس نین(٣)

٣٢ - {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، كِلاَنَا جُنُبٌ، وَكَانَ يَأْمُرُنِي فَأَتَّزِرُ، فَيُبَاشِرُنِي وَأَنَا حَائِضٌ، وَكَانَ يُخْرِجُ رَأْسَهُ إِلَيَّ، وَهُوَ مُعْتَكِفٌ، فَأَغْسِلُهُ وَأَنَا حَائِضٌ}.(٤)

---

(١) الحيض والاستحاضة.

(٢) (صحيح البخاري ح ٣٢٥)، (صحيح مسلم ح ٣٣٣). وَاللَّفظُ للبخاري.

(٣) المسلم لا ينجس فالرجل الجنب، والمرأة الحائض ليسا بنجس.

(٤) (صحيح البخاري ح ٢٩٥).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ خۆمان دەشۆرد لە یەك تەشتدا، هەردووکیشمان لەشگران بووین، فەرمانی پێدەکردم نێوان ناوك و ئەژنۆم داپۆشم، ئنجا نزیکم دەکەوتەوەو دەستی بەرم دەکەوت، لە کاتێکدا من لە سووڕی مانگانەشدا بووم، هەروەها کاتێ ئیعتیکافی دەکرد (لە مزگەوت) سەری دەهێنایە ژوورەوە بۆ لام، منیش (قژیم) دەشۆرد، لە کاتێکدا لە سووڕی مانگانەدا بووم.

## ئاسانکاری لەسەر خەڵك کاتێ خواردن ئامادە دەبێ لە کاتی نوێژدا[1]

ئەویش لە جێبەجێ کردنی فـەرمایشتی خــوایە: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴿١٨٥﴾﴾ البقرة.

واتە: خوا ئاسانی بۆتان دەوێ و، نایەوێ سەغڵەتتان بکات.

٣٣ - {عَنِ ابْنِ عُمرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِذَا وُضِعَ عَشَاءُ أَحَدِكُمْ، وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ، وَلاَ يَعْجَلْ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْهُ»}[2].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خواردن بۆ یەکێکتان دانراو، قامەت بۆ نوێژ کرا، سەرەتا دەست بکەن بە نان خواردن، با (ئەو کەسە) پەلە نەکات هەتا خواردنەکەی تەواو دەکات.

---

(١) التيسير على الناس اذا حضر طعام العشاء وقت الصلاة، ومن تطبيقات قوله تعالى: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴿١٨٥﴾﴾ البقرة.

(٢) (صحيح البخاري ح ٦٧٣).

## ئامادە بوونی ئافرەتان بۆ نوێژی بەکۆمەڵ لە مزگەوت[١]

٣٤ - {عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا اسْتَأْذَنَتْ أَحَدَكُمُ امْرَأَتُهُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَلاَ يَمْنَعْهَا»}[٢]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خێزانی هەر یەکێکتان مۆڵەتی خواست بۆ هاتنە مزگەوت، با ڕێی لێ نەگرێت.

## دوو ڕکاتی سوننەتی بەرەبەیان[٣]

٣٥ - {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى شَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مِنْهُ تَعَاهُدًا عَلَى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ}[٤].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هیچ سوننەتێك لە سوننەتەکان ئەوەندەی دوو ڕکاتی بەرەبەیان (واتە: پێش نوێژی بەیانی) پابەند نەبووە پێیەوە. (واتە: زۆر سوور بووە ئەم دوو ڕکاتە بکات).

---

(١) حضور النساء صلاة الجماعة في المساجد.

(٢) (صحيح البخاري ح ٤١٦٦).

(٣) وركعتي سنة الفجر.

(٤) (صحيح البخاري ح ١١٦٩).

## نوێژە سوننەتەکانی دوای نوێژی فەڕز[١]

وەك فەرموودەی قودسی خـوا : (بەردەوام بەندەکەم لێم نزیك دەبێتەوە بە سوننەتەکان هەتا خۆشم دەوێ)[٢].

٣٦- {عَنْ عَبْدِ اللّه بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللّهِ ﷺ، رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الجُمُعَةِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعدَ المَغْرِبِ، وَرَكْعَتَينِ بَعدَ العِشَاءِ}[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی (سوننەتم) کردن، دوو ڕکات پێش نیوەڕۆ، دوو ڕکات دوای نیوەڕۆ، دوو ڕکات دوای هەینی، دوو ڕکات دوای مەغریب، وە دوو ڕکات دوای عیشا.

## بانگدان بە جووت و، قامەت کردنیش بە تاك[٤]

٣٧- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ}[٥]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: فەرمانکرا بە بیلال کە جووت جووت بانگ بدات و، بە تاك تاکیش قامەت بکات.

---

(١) الصلوات النافلة بعد الفريضة وقوله عليه الصلاة والسلام ( وما يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى احبه)

(٢) (صحيح البخاري ح ١١١٢).

(٣) (صحيح البخاري ح ١١٦٥).

(٤) الاذان شفعا والإقامة وترا.

(٥) (صحيح البخاري ح ٦٠٦).

## ئیمام هانی نوێژ خوێنان دەدات بۆ ئەوەی ڕیزەکانیان ڕێك بخەن[١]

٣٨ - {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه ﷺ: «سَوُّوا صَفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلاَةِ»}[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕیزەکانتان ڕێك و ڕاست بکەن، چونکە ڕێك و ڕاستی ڕیز، لە تەواوی نوێژە.

## پێویستە لەسەر نوێژ خوێنان شوێن ئیمـام بکەون لە ناو نوێژەکەیدا[٣]، بەهیچ شێوەیەك دروست نیە بەگوفتار یان بە کردار پێشی بکەون

٣٩ - {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: سَقَطَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ عَنْ فَرَسٍ فَجُحِشَ شِقُّهُ الأَيْمَنُ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ نَعُودُهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَصَلَّى بِنا قَاعِدًا، فَقَعَدْنَا؛ فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ، قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ؛ فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَع فارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا»}[٤].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەسپێك کەوتە خوارەوە لای ڕاستیی بریندار بوو، ئێمەش چووینە لای وەك نەخۆش

---

(١) الإمام يحث المصلين على تسوية الصفوف

(٢) (صحيح البخاري ح ٧٢٣).

(٣) على المصلين ان يتابعوا الإمام في صلاته، ولا يتقدموا عليه بفعل أو قول

(٤) (صحيح البخاري ح ٧٣٤).

سەرداڼمان کرد، کاتی نوێژکردن هات، نوێژی بۆ کردین بە دانیشتنەوە، ئێمەش دانیشتین، کە نوێژ تەواو بوو، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بێگومان ئیمام تەنیا بۆ ئەوە دانراوە پەیڕەوی بکرێ، ئەگەر (اللّه أكبر)ی کرد ئێوەش (اللّه أكبر) بکەن، وە ئەگەر چووە ڕکووع بردن ئێوەش ڕکووع ببەن، ئەگەر هەڵساوە هەڵسنەوە، وە ئەگەر گوتی: (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) وە ئەگەر سوجدەی برد ئێوەش سوجدە ببەن.

## لە فراوانی ڕەحمەتی خوا ئەوەیە: هەندێ جار بە هۆی پەرستشێکی ئاسانەوە، وەك گوتنی: ئامین لە دوای ئیمام دەیانخاتە بەهەشتەوە

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الأنبياء[1]

واتە: ئەی محـمد ﷺ تۆمان نەناردوە مەگەر وەك بەزەییەك بۆ هەموو جیهانییان.

٤٠ - {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَمَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»}[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: هەر کاتێك ئیمام گوتی: (آمین)، ئێوەش بڵێن (آمین)، ئەگەر هەر یەکێك لەگەڵ فریشتەکان بڵێ: (آمین)، ئەوە خوا لە هەموو گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێ.

---

(١) قوله تعالى: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾الأنبياء، ومن سعة رحمته انه سبحانه يدخلهم الجنة احيانا بعبادة يسيرة كالتأمين بعد الإمام

(٢) (صحيح البخاري ح ٤٤٧٥).

## ئیمام کاتێ نوێژ بۆ خەڵکی دەکات، نوێژەکەی درێژ نەکاتەوە

فەرموودەی خوای جێبەجێ کردوە: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴿١٨٥﴾ ﴾البقرة[1]

واتە: خوا ئاسانی بۆتان دەوێ و، نایەوێ سەغڵەتتان بکات.

٤١ - {عَنْ أَبِي هُرَيْرَة ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ، فَلْيُجَوِّزْ؛ فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ، وَالْكَبِيرَ، وَذَا الْحَاجَةِ»}[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان ئێوە هەندێکتان تێدایە کە خەڵکی دووردەخەنەوە (لە دینداری)، با هەر یەکێکتان کە پێشنوێژی بۆ خەڵك دەکات نوێژەکەی کورت بێ، چونکە خەڵکی بێ توانا و بە تەمەن و خاوەن کاریان تێدایە.

## دووعای دەست پێکردنی نوێژ[3]

٤٢ - {عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى اَلصَّلَاةِ قَالَ: «وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفاً، وَمَا أَنَا

---

(١) من تطبيقات قوله تعالى: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقرة، أن يخفف الإمام في صلاته بالناس

(٢) (صحيح البخاري ح ٧٠٢).

(٣) دعاء استفتاح الصلاة.

مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلاتِي، وَنُسُكِي، وَمَحْيَايَ، وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَبذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ»}.[1]

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەستی کردبایە بە نوێژ دەیفەرموو: ڕووم کردە ئەو زاتەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە بە نیەت و مەبەستێکی پاك و سروشتەوەو لە هاوبەشدانەران نیم، بە ڕاستی نوێژ و سەربڕین و ژیان و مردنم تەنیا بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییانە، هیچ هاوبەشێکی نیە، وە بەوە فەرمانم پێکراوەو من لە مسوڵمانانم.**

## خوێندنی سووڕەتی فاتیحە یەکێکە لە پایەکانی نوێژ[2]

**خوا دەفەرموێ:** ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾الحجر.

**واتە: بێگومان ئێمە حەوت ئایەتە دووبارەکان و قورئانی مەزنمان پێداوی.**

٤٣ - {عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ»}[3]

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی نەکردوە ئەو کەسەی سووڕەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێ.**

---

(١) (صحيح مسلم ح ٧٧١).

(٢) قراءة الفاتحة ركن من أركان الصلاة، وقوله تعالى: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾الحجر.

(٣) (صحيح البخاري ح ٧٥٦)، أخرجه البخاري في: كتاب الأذان: ٩٥ باب وجوب القراءة للإمام والمأموم في الصلوات كلها.

## ئەو کەسەی بە هەڵە نوێژی کردو پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایی کردو فێری پایەکانی نوێژی کرد[١]

٤٤- {مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِلرَّجُلِ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا»}[٢]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: ئەگەر هەڵسایت بۆ نوێژ (اللّه أكبر) بکە، پاشان چەند لە قورئان (خوا بۆی) ئاسان کردی بیخوێنە، ئنجا بڕۆ بۆ ڕکووع هەتا دڵنیا دەبی ڕکووعت بردوە، پاشان هەڵسەوە هەتا بە تەواوی ڕێك دەبیت، پاشان سوجدە ببە هەتا دڵنیا دەبیت سوجدەت بردوە، ئنجا سەرت بەرزبکەرەوە هەتا دڵنیا دەبیت دانیشتووی، پاشان لە هەموو نوێژەکەتدا ئەمە بکە.

(جمهوری زانایان گوتوویانە: خوێندنی فاتیحە مەرجەو، لەگەڵ ئەویش نوێژخوێن هەرچەندی ویستی دەتوانێ بیخوێنێ، ئەگەر ئایەتێکیش بێ).

---

(١) حديث المسيء في صلاته وتوجيه النبـي الكريم له وتعليمه اركان الصلاة، وقوله عليه الصلاة والسلام (صلُّوا كما رأيتُموني أُصلِّي).

(٢) صحيح البخاري ح ٧٥٧).

## ئەوەی نوێژ خوێن دەیخوێنێ
## لە دانیشتنی تەحیاتدا[١]

٤٥ - {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، فَكَانَ يَقُولُ: «التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ للهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّه وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّه الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إلاَّ اللَّه وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ»}[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری شایەدی تەحیاتی دەکردین، وەکو چۆن سوورەتێکی قوڕئانی فێر دەکردین، دەیفەرموو: هەرچی گەورەیی و پیرۆزی و پاڕانەوەو وتەی جوان و کردەوەی پاکە تەنیا بۆ خوایە، سڵاوو ڕەحمەت و بەرەکەت لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ، سڵاو لەسەر ئێمە و هەموو بەندە چاکەکان، شایەدی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم موحەممەد پێغەمبەری خوایە.

---

(١) ما يقوله المصلي في جلسة التشهد

(٢) (صحيح مسلم ح ٤٠٣).

## چۆنیەتی دانانی پەنجەکانی دەستی ڕاست لە کاتی تەحیات و جوڵاندنی پەنجەی شایەتمان[١]

٤٦ - {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلاَةِ، وَضَعَ كَفَّهُ الْيُمْنَى، عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَقَبَضَ أَصَابِعَهُ كُلَّهَا، وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ الَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ، وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى}[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر دابنیشتایە بۆ نوێژ لەپی دەستی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دادەناو هەموو پەنجەکانی دەنوقاند و بە پەنجەی شایەتمان ئاماژەی دەکرد، وە لەپی دەستی چەپی لە سەر ڕانی چەپی دادەنا.

٤٧ - {حَدِيث ابْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، بلَفظ: كَانَ يُشِيرُ بِالسَّبَّابَةِ وَلاَ يُحَرِّكُهَا}[٣].

---

(١) كيفية وضع أصابع اليد اليمنى اثناء التشهد، وتحريك السبابة من عدمها.

(٢) صحيح مسلم ح ٥٨٠).

(٣) عند أحمد وأبي داود والنسائي وابن حبان في صحيحه وقال النووي في شرح المهذب، ٣ ٤٥٤ إسناده صحيح، وقال الحافظ ابن حجر في التلخيص الحبير٤٢٦/١، وهذا الحديث أصله في مسلم دون قوله: ولا يجاوز بصره إشارته. قلت أصل المسألة ماقتصرت عليه الرواية في الصحيح وأعني لفظ مسلم (وأشارة بأصبعه التي تلي الإبهام). أما زيادة (يحركها) قد اعتبرها بعضهم شاذة فقد انفرد بها زائدة بن قدامة وحده من بين أصحاب عاصم ابن كليب الأحد العشر وفيهم كبار أئمة الحديث ....، ولكن البعض الاخر اعتبرها زيادة مقبولة، وقال: لكن المثبت للتحريك مقدم على النافي له قلت: (البرزنجي) وهذا خلاف قديم يتجدد ولكن الجميع حريص على اتباع السنة فنقول وبالله التوفيق نرجو ان قد أصاب السنة إن شاء الله سواء من حركها ومن لم يحركها كل على مذهب من صحح الزيادة او ضعفها.

واتە: لە فەرموودەی ئیبنو زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەم بێژە هاتوە: بە پەنجەی شایەتمان ئاماژەی دەکرد و نەیدەجوڵاندەوە.

ڕیوایەتی دیکە هەیە، کە دەڵێ: دەیجوڵاند، ئەوە خیلافی کۆنە لە نێوان زانایان تازە دەبێتەوە، إن شاءالله هەردوو مذهب ئەوەی دەیجولێنن و ئەوەی نایجوڵێن موافقی سوننەتن، بەگوێرەی ئەو زانایانەی کە جوڵاندنیان بە صحیح داناوە وە ئەوانەش کە جوڵاندنیان بە (ضعیف) دناوە.

## ئەوەی نوێژ خوێن دەیکات کاتێ دەچێتە نێو مزگەوتەوە پێش دانیشتن[1]

٤٨ - {عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ»}[2].

واتە: ئەبو قەتادەی ئەنصاڕیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان چووە نێو مزگەوت، با دوو ڕکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دابنیشێ.

## شێوەی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە دوای شایەتمانی نێو تەحیات[3]

٤٩ - {عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، قَالَ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ عَلَيْنَا، فقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ عَلِمْنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: قُولُوا:

---

(١) ما يفعله المصلي حين يدخل المسجد قبل ان يجلس.

(٢) (صحيح البخاري ح ٤٤٤).

(٣) صيغة الصلاة على النبـي ﷺ بعد التشهد.

«اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»}[١].

**واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ هاتە دەر بۆلامان، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە زانیمان چۆن سڵاوت لێ بکەین، ئایا ئەدی چۆن صەڵاواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: خوایە! ڕەحمەت بڕێژە بۆ سەر موحەممەد، وە ئالی موحەممەد (خێزان و ئامۆزاکان و شوێنکەوتووانی دەگرێتەوە)، هەر وەك چۆن ڕەحمەتت ڕژاندە سەر ئیبراهیم و ئالی ئیبراهیم و شوێنکەوتووانی، بێگومان تۆ سوپاسکراوو خاوەن شکۆو ڕێزیت، خوایە! پیزو بەرەکەت بڕێژە سەر موحەممەد، وە خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، هەروەك چۆن پیزو بەرەکەتت ڕژاندە سەر ئیبراهیم و خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، بە ڕاستی تۆ سوپاسکراوو خاوەن شکۆو ڕێزیت.**

## لەو پاڕانەوانەی کە هاتوون دوای صەڵاواتی ئیبراهیمی پێش سەلامدانەوە[٢]

٥٠ - {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذْ باللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ القَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ»}[٣]

---

(١) (صحيح البخاري ح ٦٣٥٧ و ٣٣٧٠).

(٢) من الأدعية المأثورة بعد الصلاة الابراهيمية قبل التسليم.

(٣) (صحيح مسلم ح ٥٨٨).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان شایەتمانی خوێند، ئەوە با پەنا بە خوا بگرێ لە چوار شت: بڵێ: ئەی خوایە! من پەنا بە تۆ دەگرم لە سزای دۆزەخ، وە لە سزای ناو گۆڕ، لە بەڵای ژیان و مردن، لە بەڵاو ئاژاوەی مەسیحی دەججال.

## سوننەتە ئیمام کە نوێژ بۆ خەڵك دەکات، سوورەتە کورتەکان بخوێنێ[1]

٥١ - {عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِمعَاذٍ: «فَلَوْلاَ صَلَّيْتَ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى، وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى، فَإِنَّهُ يُصَلِّي وَرَاءَكَ الْكَبِيرُ، وَذُو الْحَاجَةِ، وَالضَّعِيفُ»}[2].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە موعازی فەرموو: ئەگەر نوێژت کرد ئەم سوورەتانە بخوێنە: (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى، وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) چونکە کەسانی بە تەمەن و خاوەن پێداویستی و لاواز نوێژت لە دوا دەکەن.

---

(١) من السنة قراءة الإمام قصار السور عندما يؤم المصلين، كصورة من معاني قوله تعالى: ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴿١٨٥﴾ ﴾البقرة.

(٢) (صحيح البخاري ح ٧٠١ و ٧٠٥).

## تێپەڕ بوونی منداڵ و ئافرەت بەپێشی نوێژ خوێندا نوێژەکەی نابڕێ[1].

٥٢ - {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرِجْلاَيَ فِي قِبْلَتِهِ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا، وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ}[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من دەخەوتم لە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ قاچەکانم لەو شوێنە بوو قیبلەی ئەو بوو (بۆ نوێژکردن)، (پێغەمبەر ﷺ) ئەگەر سوجدەی ببردبایە لە قاچمی دەدا (وەك ئاگادار کردنەوە) منیش قاچم دەکێشاوەو کۆدەکردەوە، ئەگەر هەڵسابا درێژم دەکردەوە، ماڵەکان ئەو کات چرایان تێدا نەبوو.

## ئەوەی دروست نیە لە قسە کردن لە نێو نوێژ[3]

خوا دەفەرموێ: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾البقرة.

واتە: بە ملکەچی و بێ دەنگ بۆ خوا بوەستن.

٥٣ - {عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِي الصَّلاَةِ، يُكَلِّمُ أَحَدُنَا أَخَاهُ فِي حَاجَتِهِ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾البقرة، فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ}[4].

---

(١) مرورالغلام والمرأة بين يدي المصلي لا يقطع صلاته.

(٢) (صحيح البخاري ح ٣٨٢).

(٣) ما ينهى من الكلام في الصلاة وقوله تعالى: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾البقرة.

(٤) (صحيح البخاري ح ٤٢٦٠).

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ، دەڵێ: ئێمە (عادەتمان وابوو) لە نوێژ لەگەڵ یەکدی قسەمان دەکرد، یەکێکمان لەگەڵ برایەکەی قسەی دەکرد ئیشێکی پێبایە دەیدواند، هەتا ئەم ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێ: ﴿ حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴾ البقرة.واتە: پارێزگاریی لە نوێژەکانتان بکەن، وە نوێژی نێوەڕاست بە تایبەت، وە بۆ خوا بە ملکەچیی بێ دەنگ ڕابوەستن. فەرمانمان پێکرا بێدەنگ بین.

زانایان دوو بۆچوونیان هەیە دەربارەی نوێژی نێوە ڕاست:

١- هەندێك گوتوویانە: نوێژی نیوەڕۆیە.

٢- هەندێك گوتوویانە: نوێژی عەسرە.

## کەفارەتی ئەو کەسەی نوێژێکی لە بیر دەچێ

ئەوەیە: هەر کاتێك بیری هاتەوە نوێژەکەی بکات[1].

٥٤ - {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَسِيَ صَلاَةً، فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذلِكَ»، وَأَقِمِ الصَّلاَةَ لِذِكْرِي}[2]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك نوێژی لە بیرچوو (لە کاتی خۆیدا بیکات)، ئەوە هەرکات بیری هاتەوە با نوێژەکەی بکات، چونکە ئەمە هیچ کەفارەتێکی بۆ نیە، جگە

---

(١) كفارة من نسي الصلاة ان يصليها حين يتذكرها.

(٢) (صحيح البخاري ح ٥٩٧).

لە ئەنجامدانی نوێژەکە، خوای بەرز دەفەرموێ: (وَأَقِمِ الصَّلاَةَ لِذِكْرِي)[١] واتە: نوێژ ئەنجام بدەن تاکو یادی منی تێدا بکەن.



## نوێـژی ویتـر[٢]

٥٥ - {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُلَّ اللَّيْلِ أَوْتَرَ رسُولُ اللّهِ ﷺ، وانْتَهى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ}[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شەوێك ویتری دەکرد، ویترەکەی کۆتایی پێدەهێنا لە پارشێو.

مەبەست ئەوەیە: هەر چۆنێك بۆی کرابێ، کردوویەتی، هەندێك جار لە سەرەتای شەو ویترەکەی کردوە، هەندێك جار لە نێوەڕاستی شەو ویترەکەی کردوە، هەندێك جار لە کۆتایی شەو ویترەکەی کردوە، هەندێك جار حەزی کردوە لە سەحەر، واتە: پێش بانگی بەیانی ویترەکەی تەواو بکات، بەڵام بە پێی توانا، ئەوەش وەك ئاسانکاریی بۆ مسوڵمانان.

## داوای لێخۆشبوون دوای سەلام دانەوە[٤]

٥٦ - {عَنْ ثَوْبَان ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللّهِ ﷺ يُحَدِّثُ، أَنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ، كَانَ إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلاَتِهِ اسْتَغْفَرَ ثلاَثَاً، وَقَالَ: اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ، وَمِنْكَ السَّلاَمُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ}[٥].

---

(١) طه: ١٤.

(٢) صلاة الوتر.

(٣) (صحيح البخاري ح ٩٩٦)، كتاب الوتر: باب ساعات الوتر.

(٤) الإستغفار بعد الصلاة.

(٥) (صحيح مسلم ح ٥٩١).

واتە: ئەوبان ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە نوێژ تەواو دەبوو، سێ جار داوای لێخۆشبوونی دەکرد، وە دەیفەرموو: خوایە تۆ سەلامی، ئاشتی و سەلامەتیش لە تۆوەیە، بەرزی و پیرۆزی بۆ تۆیە، ئەی خاوەن دەسەڵات و گەورەیی و ڕێز.

## کۆکردنەوەی نوێژ لەنێوان نیوەڕۆ و عەسر و، مەغریب و عیشا[١]

هەروەها کورتکردنەوەی ئەو نوێژانەی چوار ڕکاتن لە سەفەردا

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ ﴿١٠١﴾ ﴾النساء.

واتە: وە (ئەی بڕوادارینە!) هەرکات بەزەویدا ڕۆیشتن ئەگەر ترسان ئەوانەی بێبڕوان ئازارتان بدەن، گوناهتان ناگات ئەگەر لە نوێژەکەتان کورت بکەنەوە.

٥٧ - {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاَةِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، إِذَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ سَيْرٍ، وَيَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ}[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسری کۆدەکردنەوە، کاتێك لە سەفەر بووایە، وە نوێژی مەغریب و عیشای کۆدەکردنەوە.

- - - - - - - - - - - - - - - - - - - -

(١) الجمع بين الظهر والعصر والمغرب والعشاء، وقصر الصلاة الرباعية في السفر، وقوله تعالى: ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ ﴿١٠١﴾ ﴾ النساء.

(٢) صحيح البخاري كتاب تقصير الصلاة ح ١١٠٧.

٥٨ - {عَنْ عَبْدِ اللّه بْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزائِمُهُ»}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا حەز دەکات و پێی خۆشە مۆڵەتەکانی وەربگیرێن، هەروەك چۆن پێی خۆشە ئەرکە قورسەکانیشی جێبەجێ بکرێن.

## هۆکارەکانی گواستنەوەو بە جێهێنانی نوێژ[2]

٥٩ - {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ، فَإِذَا أَرَادَ الْفَرِيضَةَ نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَ}[3].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد لەسەر سواریەکەی ڕووی لە هەر کوێ بووایە، بەڵام کاتێ بیویستایە نوێژە فەڕزەکان بکات دادەبەزی و ڕووی دەکردە ڕووگە (قیبلە).

---

(١) أخرجه أحمد برقم (٥٨٦٦)، والبزار كما في كشف الأستار برقم (٩٨٨)، والطبراني في الأوسط برقم (٥٣٠٢)، قال الهيثمي (١٦٢/٣): رواه أحمد، ورجاله رجال الصحيح، والبزار والطبراني في الأوسط وإسناده حسن، وأخرجه إبن حبان برقم: ٣٤٥، واللفط له، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

(٢) وسائط النقل وأداء الصلاة.

(٣) (صحيح البخاري ح ٤٠٠).

## خۆشۆردن (لە ڕۆژی) هەینی[١]

٦٠ - {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ جَاءَ مِنْكُمُ الجُمُعَةَ فلْيَغْتَسِلْ»}[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر یەکێك لە ئێوە هات بۆ (نوێژی) هەینی با خۆی بشۆرێ.

## وتـاری هەینی[٣]

٦١ - {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ يَخْطُبُ خُطْبَتَيْنِ يَقْعُدُ بَيْنَهُمَا}[٤].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (لە ڕۆژی هەینی) دوو وتاری دەدان و لە نێوان هەردووکیان دادەنیشت.

---

(١) غسل الجمعة.

(٢) (صحيح البخاري ح ٨٥٤)، (صحيح مسلم ح ١٩٨٩).

(٣) خطبة الجمعة.

(٤) صحيح البخاري كتاب العيدين ح ٩٢٨.

## نوێژی هەردوو جەژن پێش وتار خوێندن[1]

٦٢ - {عَنْ عَبدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ النَّبيُّ ﷺ وَأبُو بَكْرٍ وَعُمَر يُصَلُّونَ الْعِيدَينِ، قَبْلَ الْخُطْبَةِ}[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکرو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) نوێژی جەژنەکانیان دەکرد پێش وتاردان.

## دەرچوونی ئافرەتان بۆ نوێژی هەردوو جەژن[3]

٦٣ - {عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ «نُسَيْبَةَ الأَنْصَارِيَّةِ، رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنَّا نُؤْمَرُ أَنْ نَخْرُجَ يَوْمَ الْعِيدِ، حَتَّى نُخْرِجَ الْبِكْرَ مِنْ خِدْرِهَا، حَتَّى تَخْرُجَ الْحُيَّضُ، فَيُكَبِّرْنَ بِتَكْبِيرِهِمْ وَيَدْعُونَ بِدُعَائِهِمْ، يَرْجُونَ بَرَكَةَ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَطُهْرَتَهُ}[4].

واتە: ئومم و عەتیە نوسەیبەی ئەنصاڕیی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە فەرمانمان پێدەکرا لە ڕۆژی جەژندا دەربچین تەنانەت کچانیش لەگەڵ خۆمان ببەین، هەروەها ئەو ئافرەتانەش کە لە سووڕی مانگانەدا بوون لە دوای خەڵکەوە ڕێك بوەستن و بە تەکبیری ئەوان تەکبیر بکەن، وە بە پاڕانەوەی ئەوانیش بپاڕێنەوە، ئومێدی پیرۆز بەرەکەت و پاکی ئەو ڕۆژە بکەن.

---

(١) صلاة العيدين قبل الخطبة.

(٢) صحيح البخاري كتاب العيدين ح ٩٦٣.

(٣) خروج النساء لصلاة العيدين.

(٤) صحيح البخاري كتاب العيدين.ح ٩٧١.

## خۆرگیران و مانگ گیران لە نیشانەکانی خوان[١]

نوێــژی خۆرگیران و مــانگ گیران دوو ڕکاتە لە هەر ڕکاتێکدا دوو ڕکوعی تێدایە.

٦٤ - {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ الشَّمْسَ خَسَفَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَبَعَثَ مُنَادِياً يُنَادِي: أَنِ الصَّلَاةَ جَامِعَةً، فَاجْتَمَعُوا وَاصْطَفُّوا، فَصَلَّى بِهِمْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي رَكْعَتَيْنِ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ}[٢]

واتە: عائیشــە (خــوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە ســەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆرگیرا فەرمان کرا بە بانگدەر بانگ بدات: (أَنِ الصَّلَاةَ جَامِعَةً) واتە: بێگومان نوێژ کۆکەرەوەیە، خەڵکەکە کۆبوونەوەو ڕیزیان بەست، دوو ڕکات نوێژی بۆ کردن، لە هەر ڕکاتێکدا دوو ڕکوعی تێدابوو، لەگەڵ چوار سوجدە.

٦٥ - {عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسولِ اللَّهِ ﷺ يَومَ مَاتَ إِبْرَاهِيمُ، فَقالَ النَّاسُ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ، فَقالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّمْسَ والقَمَرَ لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ فَصَلُّوا، وَادْعُوا اللَّهَ»}[٣].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ، دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆرگیرا، لەو ڕۆژەی ئیبراهیم (ی کوڕی پێغەمبەر ﷺ) تێیدا مرد، خەڵك گوتیان: خۆر گیرا لەبەر مردنی ئیبراهیم، پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) الخسوف من آيات الله، وصلاة الكسوف ركعتان في كل ركعة ركوعان.

(٢) صحيح البخاري كتاب الكسوف ح ١٠٦٦، وأخرجه النسائي في سننه ح ١٤٦٥.

(٣) صحيح البخاري كتاب الكسوف ح ١٠٤٣.

فەرمووی: بێگومان خۆرو مانگ لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێك ناگیرێن، ئەگەر ئەوەتان بینی نوێژ بکەن و لە خوا بپاڕێنەوە.

## نوێـژە بـارانـە[١]

٦٦ - {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ بنِ عَاصِمٍ الـمَـازِنِيِّ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ خَرَجَ يَسْتَسْقِي، قَالَ: فَحَوَّلَ إِلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ يَدْعُو، ثُمَّ حَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ صَلَّى لَنَا رَكْعَتَيْنِ جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ}.[٢]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصمی مازینی ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی ڕۆژێك هاتە دەرەوە بۆ نوێژە بارانە، پشتی لە خەڵکەکە کرد، ڕووی کردبووە قیبلەو لە خوا دەپاڕایەوە، پاشان پۆشاکەکەی هەڵگەڕاندەوە و، دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین دەنگی تێدا بەرز کردەوە.

## نوێژی جەنازە و حوکمەکانی[٣]

٦٧- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَعَى النَّبِيُّ ﷺ إِلى أَصْحَابِهِ النَّجَاشِيَّ، ثُمَّ تَقَدَّمَ فَصَفُّوا خَلْفَهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِ، وَكَبَّرَ أَرْبَعَاً}[٤]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەواڵی مردنی نەجاشی بە هاوەڵانی ڕاگەیاند، پاشان چووە پێشیانەوە، ئەوانیش ڕیز بوون لە دوای، نوێژی لەسەر کردو چوار تەکبیری کرد.

---

(١) صلاة الاستسقاء.

(٢) صحيح البخاري كتاب الاستسقاء ح ١٠٢٥.

(٣) صلاة الجنازة واحكامها.

(٤) صحيح البخاري كتاب الجنائز ح ١٣١٨ و ح ٣٨٨١.

٦٨- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: السُّنَّةُ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الْجَنَازَةِ أَنْ يَقْرَأَ فِي التَّكْبِيرَةِ الْأُولَى بِأُمِّ الْقُرْآنِ مُخَافَتَةً، ثُمَّ يُكَبِّرَ ثَلَاثاً، وَالتَّسْلِيمُ عِنْدَ الآخِرَةِ}[١].



واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: سوننەتە لە نوێژی مردوودا دوای تەکبیرە (اللّه أکبر)ی یەکەم سوورەتی فاتیحە بە نهێنی بخوێنرێ، پاشان سێ جار تەکبیر (اللّه أکبر) بکرێ، لە کۆتاییش دا سەلام بدرێتەوە.

## کفنی پێغـەمبـەر ﷺ[٢]

٦٩- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، دَخَلْتُ عَلَى أَبِي بَكْرٍ ﷺ، فَقَالَ: فِـي كَمْ كَفَّنْتُمُ النَّبِيَّ ﷺ؟ قَالَتْ: فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ بِيْضٍ سَحُولِيَّةٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ}[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: من چوومە ژوورەوە بۆ لای ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: لە چەند پارچە (قوماش)دا پێغەمبەرتان کفن کرد؟ (عائیشە) دەڵێ: (گوتم:) پێغەمبەر ﷺ کفن کرا لە سێ پارچە قوماشی یەمەنی سپیدا، نە کراس و نە مێزەری تێدا نەبوو.

---

(١) أخرجه النسائي في سننه ح١٩٨٩، وقال النووي في المجموع ٢٣٣/٥ إسناده على شرط الشيخين.

(٢) كفن النبـي صلى اللّه عليه وسلم.

(٣) صحيح البخاري كتاب الجنائز ح ١٣٨٧.

## شۆردن و كفن كردنی مردووی خاوەن ئیحرام[١]

٧٠- {عَنْ عَبْدِ اللّهِ بنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ، إِذْ وَقَعَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَوَقَصَتْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ، وَلا تُحَنِّطُوهُ، وَلا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّياً}[٢].

واته: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: لە كاتێكدا پیاوێك لە عەڕەفە وەستا بوو، لەسەر سواریەكەی كەوتە خوارەوەو ملی شكاو (مرد)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیشۆرن بە ئاوو سیدر، كفنی بكەن لە دوو پۆشاكدا، وە بۆنی خۆشی لێمەدەن و سەری دامەپۆشن، چونكە لە ڕۆژی دواییدا كە زیندوو دەكرێتەوە تەلبیە[٣] دەكات.

## پەلە كردن لە ناشتنی مردوو[٤]

٧١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَسْرِعُوا بالجَنَازَةِ، فَإِن تَكُ صَالِحَةً، فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إِلَيْهِ، وَإِنْ تَكُ سِوَى ذَلِكَ، فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ»}[٥].

واته: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەلە بكەن لە بەڕێ كردنی مردوودا، ئەگەر (كەسێكی) باش بێ، باشترە زوو

---

(١) غسل وتكفين الميت المحرم.

(٢) صحيح البخاري كتاب الجنائز ح ١٢٦٥.

(٣) (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ. لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ لبَّيْكَ. إِنَّ الحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ. لا شَرِيكَ لكَ).

(٤) الاسراع بدفن الميت.

(٥) صحيح البخاري كتاب الجنائز ح ١٣١٥.

بەو خێرەی بگەیەنن، خۆ ئەگەر واش نەبێ (کەسێکی خراپ بێ) ئەوە بەڵایەکە لەسەر خۆتانی لادەدەن.



## پاداشتی ئەو کەسەی شوێنی جەنازە دەکەوێ تا دەنێژرێ[١]

٧٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ شَهِدَ جَنَازَةً حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَ حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ، قِيلَ: وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ»} [٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئامادەی مردوویەك بێ هەتا نوێژی لە سەر دەکرێ، ئەوە (پاداشتی) یەك قیراتی بۆ هەیە، هەر کەسێکیش ئامادەی بێ هەتا دەنێژرێ ئەوە (پاداشتی) دوو قیراتی بۆ هەیە، گوترا: ئەو دوو قیراتانە چین؟ فەرمووی: وەك (یان ئەوەندەی) دوو کێوی گەورەن.

## ئارامگرتن لە کاتی لەدەستدانی مردوو

قەدەغەکردن لە خۆ بێزارکردن و سنگ دادڕین[٣]

٧٣- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجاهِلِيَّةِ»}[٤]

---

(١) أجر من تبع الجنازة حتى تدفن.

(٢) صحيح البخاري كتاب الجنائز ح ١٣٢٥.

(٣) الصبر على فقد الميت والنهي عن الجزع وشق الجيوب.

(٤) صحيح البخاري كتاب الجنائز ١٢٩٤.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ئێمە نیە هەر کەسێك لە ڕوومەتی خۆی بدا، ڕوومەتی خۆی بڕنێتەوە، وە یەخەی خۆی دابدڕێ، وە وەك سەردەمی نەفامی بە مردوو بلاوێتەوە.

مامۆستا ئیبنو باز ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەربارەی ئەم فەرموودە کە دەفەرموێ: (لیس منا ...) دەڵێ: بە زۆری ئەم فەرموودانە بۆ هەڕەشە کردن و ورياکردنەوەو ترساندنە، بۆ ئەو گوناهانەی کە تێیاندا باس دەکرێ، ئەگەرنا خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام ناچێتە دەر[1].

هەروەها ئەمە، بۆچوونی مامۆستا (عبدالكريم بيارە)ش بوو ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

---

(١) قال إبن باز رحمه الله هذه الأحاديث التي فيا (ليس منا ...) في الغالب والأكثر أنها من باب الوعيد، والتحذير، والترهيب، مما ذكر فيها من المعاصي، ولا تخرج صاحبها من الإسلام.

# کار و کەسابەتی حەڵاڵ و زەکات و خەرجیەکان[1]

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنفِقُواْ مِن مَّا رَزَقۡنَٰكُم ﴿١٠﴾ ﴾المنافقون، واتە: وە ببەخشن لەوەی پێمان بەخشیون.

دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ ﴾ المؤمنون، واتە: ئەوانەی زەکاتی ماڵیان دەدەن بەکردەوە.

فەرموویەتی: ﴿ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ ﴿٢٠﴾ ﴾ المزمل، کەسانێکی دیکەش هەن بەسەر زەویدا دەڕۆن بۆ بەدەستهێنانی فەزڵ و چاکەی خوا.



---

(١) الكسب الحلال والزكوات والنفقات: وقوله تعالى: ﴿ وَأَنفِقُواْ مِن مَّا رَزَقۡنَٰكُم ﴿١٠﴾ ﴾ المنافقون، وقوله تعالى: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ ﴾المؤمنون، وقوله تعالى: ﴿ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ ﴿٢٠﴾ ﴾ المزمل.

## پێشخستنی بەخشینی لەتە خورمایەك بەسەر قسەیەکی چاکدا[1]

٧٤- {عَنْ عَدِيٍّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اتَّقُوا النَّارَ، وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»}[2].

واتە: عەدیی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆتان لە ئاگر بپارێزن، ئەگەر بە بەخشینی لەتە خورمایەکیش بێ، ئەگەر ئەوەشتان نەبوو، ئەوە بە وتەیەکی پاك و چاك.

## بڕوادار فەرمان پێکراوە، داوا لە غەیری خۆی نەکات[3]

٧٥- {عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ، ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، وَخَيْرُ الصَّدَقَةِ ما كان عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ»}[4].

واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستی بەرز لە دەستی نزم چاکترە، (ئەگەر شتێکت هەبوو بۆ خەرجکردنی ماڵ و سامانەکەت)، لەوانەوە دەست پێ بکە، کە بژێویان لەسەر تۆیە، وە باشترین بەخشین لە کاتی هەبوونی دایە، وە هەرکەسێك

---

(١) تقديم شق التمرة على الكلمة الطيبة.

(٢) (صحيح البخاري كتاب الرقاق ح ٦٥٤٠).

(٣) المؤمن مامور بأن يتعفف ولايستجدي غيره، والله يعين من استغنى.

(٤) (صحيح البخاري ح ١٤٢٧).

چاوی لە خۆپاکڕاگرتن بێ، خوا پاکی دەکات، وە هەرکەسێکیش چاوی لە بێ نیازی و دەوڵەمەندی بێ، خوای پەروەردگار بێ نیازو دەوڵەمەندی دەکات.

## بڕوادار دڵسۆزە بۆ هەموو مسوڵمانێك

٧٦- {عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ}[١].

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پەیمانم دا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەنجامدانی نوێژ و دەرکردنی زەکات و ئامۆژگاری کردن بۆ هەموو مسوڵمانێك.

## ئەندازەی زەکات لە هەندێ لە جۆرەکان[٢]

٧٧- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ فِيْمَا أَقَلُّ مِنْ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ، وَلاَ فِي أَقَلَّ مِنْ خَمْسَةٍ مِنَ الإِبْلِ الذَّوْدِ صَدَقَةٌ، وَلاَ فِي أَقَلَّ مِن خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الوَرِقِ صَدَقَةٌ»}[٣]

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دەغڵ و دان و خورمادا پێنج ویسق کەمتر بێ زەکاتی لێناکەوێ، هەروەها کەمتریش بێ لە پێنج حوشتر زەکاتی لێناکەوێ، هەروەها کەمتریش لە پێنج ئوقیە لە زیو زەکاتی لێناکەوێ.

---

(١) (صحيح البخاري ح ٥٧).

(٢) مقادير الزكاة في بعض الأصناف

(٣) (صحيح البخاري ح ١٤٨٤).

**ڕوونكردنەوە:**

(الوسق): واتە: بار، یەك ویسق شەست (٦٠) صاعە، (صاع)ێك چوار (٤) مشتە، یەك مشت یەكسانە بە (٥٦٠) گرام، وە (صاع)ێك بریتیە لە (٢٢٤٠)گم گەنمی چاك، جا ئەندازە بە یەك كیلۆگرام یەكسانە بە (٦٧٢) كیلۆگرام لە گەنمی چاك.

وە چل (٤٠) ئوقیەی شەرعی بە پێوانەو كێشانی مەككە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەرانبەر بە یەك دەرهەم بووە، جا یەك ئوقیە لای زۆربەی زانایان بریتیە لە دوو سەد (٢٠٠) گرام[١].

٧٨- {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فِيْمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ، أَوْ كَانَ عَثَرِيًّا الْعُشْرُ وَمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ»}[٢]

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر دەگێڕێتەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو (میوەو دانەوێڵەی) بە باران و كانیاو ئاو درابوو، یان باران ئاوی دەدا، بەڵام تێر ئاو نەدەبوو دەیەكی (لە دە یەكی زەكات دەدرێ)، وە ئەوەی بە هەر ئامێرێك ئاودرا بوو نیوەی دەیەكی (زەكاتی لێ دەدرێ).

---

(١) الوسق: ستون صاعا، والصاع أربعة أمداد، والمد يساوي وزناً ٥٦٠ جراما، والصاع ٢٢٤٠ جراماً من البر الجيد «تقريباً» فالنصاب بالكيلو جرام يساوي تقريباً ٦٧٢ كيلو جراماً من البر الجديد. والأوقية الشرعية : (بوزن مكة في العصر النبوي صلى الله عليه وسلم) تساوي ٤٠ درهما، فالأوقية عند الجهمور ٢٠٠ غرام تقريباً.

(٢) (صحيح البخاري ح ١٤٨٣).

# هەندێك لە حوكم
# و
# ئادابەكانی ڕۆژوو[1]



---

(١) الصيام وبعض أحكامه وآدابه.

٧٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَة ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ «لاَ تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ، وَلاَ يَوْمَيْنِ، إِلاَّ رَجُلاً كَانَ يَصُومُ صَوْمَاً فَلْيَصُمْهُ»}[١]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەمەزان بە پێش مەخەن نە بە ڕۆژێك، نە بە دوو ڕۆژان، مەگەر پیاوێك ڕۆژێك ڕۆژوو بگرێ و ڕۆژێك ڕۆژوو نەگرێ، ئەوە با ڕۆژووی تێدا بگرێ.

٨٠- {عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ ﷺ يَقُولُ: «إذا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ»}[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: کاتێك مانگتان بینی بە ڕۆژوو بن، وە کاتێك بینیتان (واتە: لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا) ئەوە بیشکێنن، وە ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە بژمێرن و ئەندازەگیری بۆ بکەن.

٨١- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «تَسَحَّروا، فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً»}[٣]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە.

٨٢- {عَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ كَانَ يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ أَهْلِهِ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ}[٤]

---

(١) صحيح البخاري كتاب الصوم ح ١٩١٤.

(٢) صحيح البخاري كتاب الصوم ح ١٩٠٠.

(٣) صحيح البخاري كتاب الصوم ح ١٩٢٣..

(٤) صحيح البخاري كتاب الصوم ح ١٩٢٥.

واتە: عائیشەو ئوم سەلەمە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەگەیشتە نوێژی بەیانی و لە لای هاوسەرەکانی بوو، وە لەشگران بوو، خۆی دەشۆردو بەڕۆژوو دەبوو.

٨٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ»}[1]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بە ڕۆژوو بوو، لە بیری چوو، (شتێکی) خوارد یان خواردەوە، ئەوە با ڕۆژووەکەی تەواو بکات، چونکە ئەوە خوا ئەو بژێوەی پێ داوە.

٨٤- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا: أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو الأَسْلَمِيَّ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ «وَكَانَ كَثِيرَ الصِّيَامِ» فَقَالَ: «إِنْ شِئْتَ فَصُمْ وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»}[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە حەمزەی کوڕی عەمڕی ئەسلەمی بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئایا لە سەفەردا بە ڕۆژوو بم؟ «ئەو کەسێك بوو زۆر بە ڕۆژوو دەبوو»، فەرمووی: ئەگەر ویستت بە ڕۆژووبە، ئەگەر ویستت بە ڕۆژوو مەبە.

٨٥- {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَرَأَى زِحَامَاً وَرَجُلاً قَدْ ظُلِّلَ عَلَيهِ، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟ فَقَالُوا: صَائِمٌ، فَقَالَ: لَيْسَ مِنَ البِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ»}[3]

---

(١) صحيح البخاري كتاب الصوم ح ١٩٣٣.

(٢) صحيح البخاري كتاب الصوم ح ١٩٤٣.

(٣) صحيح البخاري كتاب الصوم ح ١٩٤٦.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێك بوو قەرەباڵغییەکی بینی، پیاوێکیش سێبەری لێکرابوو، فەرمووی: ئەوە چییە؟ گوتیان: ئەوە بەڕۆژووە، فەرمووی: لە چاکەکاریی نیە لە سەفەردا (مرۆڤ) بە ڕۆژوو بێ.

٨٦- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ، صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ»}[1]

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك مردو ڕۆژووی لەسەر بوو، خاوەنەکەی لە جیاتی دەیگرێتەوە.

٨٧- {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ، مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ»}[2]

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام خەڵك لە خێرو چاکەدان مادام پەلە بکەن لە زوو ڕۆژوو شکاندن.

٨٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَصُومَنَّ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إلاَّ أَنْ يَصُومَ يَوْماً قَبْلَهُ، أَوْ يَوْماً بَعْدَهُ»}[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: با هیچ یەکێکتان ڕۆژی هەینی ڕۆژوو نەگرێ، مەگەر ڕۆژێك پێشی، یان پاشی بە ڕۆژوو بێ (لەگەڵی).

---

(١) صحيح البخاري كتاب الصوم ح ١٩٥٢.

(٢) صحيح البخاري كتاب الصوم ح ١٩٥٧.

(٣) صحيح البخاري كتاب الصوم ح ١٩٨٥.

## شەونوێژ کردنی ڕەمەزان و، ئیعتیکافی دە شەوی کۆتایی[1]

٨٩- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ قَالَ: «تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْوِتْرِ مِنَ الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ»}[2].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دوای شەوی قەدر بگەڕێن لە شەوە تاکەکانی دە شەوی کۆتایی (ڕەمەزان).**

٩٠- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ كَانَ يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ بَعْدَهُ}[3].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئیغتیکافی دەکرد لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان، هەتا خوای بەرزی پایەدار گیانی کێشا، پاشان دوای خۆی هاوسەرەکانی ئیعتیکافیان تێدا دەکرد.**

---

(١) قيام رمضان واعتكاف العشر الأواخر.

(٢) صحيح البخاري كتاب فضل ليلة القدر ح ٢٠١٧.

(٣) صحيح البخاري كتاب فضل ليلة القدر ح ٢٠٢٦.

# فەڕیزەی حەج و هەندێك لە ئەحكام و ئامانجەكانی[1]

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴿٩٧﴾﴾ آل عمران

**واتە: خوا بڕیاری داوە لەسەر خەڵك حەجی بەیت (بیت الحرام) بۆ هەر كەسێك توانای ماددیی و مەعنەوی هەبێ**

وە دەفەرموێ: ﴿لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ ﴿٢٨﴾﴾الحج.

**واتە: بۆ ئەوەی سوودی ماددیی و مـەعنەوی بەدەست بێنن و ببینن.**



---

(١) فريضة الحج وبعض أحكامها ومقاصدها، وقوله تعالى: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴿٩٧﴾﴾ آل عمران، وقوله تعالى: ﴿لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ ﴿٢٨﴾﴾الحج.

٩١- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَرْمِي عَلَى رَاحِلَتِهِ يَوْمَ النَّحْرِ وَيَقُولُ: «لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ، فَإِنِّي لاَ أَدْرِي لَعَلِّي لاَ أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِي هَذِهِ»}[1]

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی بەردهاویشتنی جەمەرەی دەکرد بەسەر حوشترەکەیەوە لە ڕۆژی قوربانی کردن، دەیفەرموو: خواپەرستیەکانم لێوەربگرن و (لێم فێربن)، ڕەنگە لە دوای ئەم حەجە، حەجی دیکە ئەنجام نەدەم (واتە: ئاماژەیەك دەکات، کە لەوانەیە کۆچی دوایی بکات).

٩٢- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ بِعَرَفَاتٍ: «مَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسِ الخُفَّيْنِ، ومَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَاراً فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ لِلْمُحْرِمِ»}[2]

وللبخاري رحمه الله: {وَلا تَنْتَقِبْ الْمَرْأَةُ، وَلا تَلْبَسْ الْقُفَّازَيْنِ}[3].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ لە عەڕەفات وتاری دەدا، فەرمووی: هەر کەس نەعلی نیە با خوفەکان لە پێ بکات، وە هەر کەس پەشتەماڵی نیە (خۆی پێ داپۆشێ) با شەرواڵ بپۆشی، بۆ ئەو کەسەی ئیحرام دەپۆشێ.

وە بوخاری (رحمه الله) هێناویەتی: با ئافرەت پەچە نەکات و دەستکێش لە دەست نەکات.

---

(١) (صحيح مسلم ح ١٢٩٧).

(٢) (صحيح البخاري ح ١٨٤١).

(٣) صحيح البخاري كتاب الحج ح ٨٣٨.

## وەستان لە عەرەفە یەكێكە لە پایەكانی حەج

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (حەج عەرەفەیە)[١]

٩٣- {عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ شَهِدَ صَلاَتَنَا هَذِهِ، وَوَقَفَ مَعَنَا حَتَّى نَدْفَعَ، وَقَدْ وَقَفَ بِعَرَفَةَ قَبْلَ ذَلِكَ لَيْلًا أَوْ نَهَارًا، فَقَدْ أَتَمَّ حَجَّهُ وَقَضَى تَفَثَهُ»}[٢].

واتە: عوروەی كوڕی موضەڕیس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك ئەم نوێژەمان لەگەڵ بكات، وە لەگەڵمان بوەستێ هەتا دێینە خوارەوە، پێش ئەوەش لە عەرەفە وەستا بێت، شەو بێ یان ڕۆژ، ئەوە حەجەكەی تەواو كردوەو، بۆی هەیە پیسیەكان لە خۆی بكاتەوە (وەك: نینۆك بڕین، بۆن لە خۆدان، بەرسمێڵ كورت كردن).

## بەرد هاویشتنی جەمەرەكان بە كردەوە[٣]

خوا فەرموویەتی: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ﴿١٨٥﴾﴾ البقرة.

واتە: خوا ئاسانی بۆتان دەوێ و، نایەوێ سەغڵەتتان بكات.

---

(١) الوقوف بعرفة ركن من أركان الحج وقوله (الحج عرفة) أخرجه الترمذي ح ٨٨٩، وقال: حسن صحيح.

(٢) سنن الترمذي ح ٨٩١، قال أبو عيسى هذا حديث حسن صحيح.

(٣) رمي الجمرات والترجمة العملية لقوله تعالى: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ﴿١٨٥﴾﴾ البقرة.

٩٤- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غَدَاةَ الْعَقَبَةِ، وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى رَاحِلَتِهِ «هَاتِ الْقُطْ لِي»، فَلَقَطْتُ لَهُ: حَصَيَاتٍ هُنَّ حَصَى الْخَذْفِ فَوَضَعَهُنَّ فِي يَدِهِ، فَقَالَ: «بِأَمْثَالِ هَؤُلَاءِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِالْغُلُوِّ فِي الدِّينِ»}[1]

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە (دەڵێ:) پێغەمبەر ﷺ سەر لە بەیانی عەقەبە بەسەر حوشترەکەیەوە بوو پێی فەرمووم: (پێم بدە، بۆم کۆبکەوە)، منیش هەندێ بەردم بۆی کۆکردەوە، ئەوانەیش بەردی بچوك بوون (بە قەد دەنکە نۆکێك) کاتێ خستمە نێو دەستی، فەرمووی: (بەڵێ، با وەك ئەوانە بێ، داواتان لێدەکەم زێدەڕۆیی نەکەن لە ئایندا، چونکە بەڕاستی ئەوانەی پێش ئێوە لە نێوچوون بە هۆی زێدەڕۆییان بوو لە ئایندا).

## تەوافیماڵئاوایی و ئاسانکاری بۆ ئافرەتی حەیزدار[2]

٩٥- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أُمِرَ النَّاسُ أنْ يَكونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بالبَيْتِ، إلاَّ أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الحَائِضِ}[3]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: فەرمان بە خەڵك کراوە کە دوا کاریان خوا حافیزی بێ لە کەعبە، جگە لەوانەی لە سووڕی مانگانەدان لەسەریان سووك کرابوو.

---

(١) سنن النسائي ح ٣٠٥٧ بسند صحيح.

(٢) طواف الوداع والتيسير على المرأة الحائض.

(٣) (صحيح البخاري ح ١٧٥٥).

## جوانترین نمونەی
## ئاسانکاری لەسەر خەڵك لە حەجدا[1]

٩٦- {عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عَمْروٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أنَّهُ شَهِدَ النَّبيَّ ﷺ يَخْطُبُ يَومَ النَّحْرِ، فَقَامَ إلَيْهِ رَجُلٌ فَقَالَ: كُنْتُ أحْسِبُ أنَّ كَذَا قَبْلَ كَذَا، ثُمَّ قَامَ آخَرُ فَقَالَ: كُنْتُ أحْسِبُ أَنَّ كَذَا قَبْلَ كَذَا، حَلَقْتُ قَبْلَ أنْ أنْحَرَ، نَحَرْتُ قَبْلَ أنْ أرْمِيَ، وأَشْبَاهَ ذَلِك، فَقَالَ النَّبيُّ ﷺ: «افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ لهنَّ كُلِّهِنَّ»، فَمَا سُئِلَ يَوْمَئذٍ عَنْ شَيءٍ إلاَّ قَالَ: افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ}[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە ئەو پێغەمبەر ﷺی بینی لە ڕۆژی قوربانی کردن وتاری دەدا، پیاوێك هەڵسا بۆ لای گوتی: من پێم وابوو فلاَنە شت پێش فلاَنە شتە، پاشان پیاوێکی دیکە هەڵسا گوتی: من پێم وابوو فلاَنە شت پێش فلاَنە شتە، سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی بکەم، قوربانیم کرد پێش ئەوەی بەرد باران بکەم، هاوشێوەی ئەوانە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەنجامی بدە هیچ گرفتێك لەوانەدا نیە، ئەو ڕۆژە هەر پرسیارێکی لێ کرا ئیللا دەیفەرموو: ئەنجامی بدە هیچ گرفتێکی تێدانیە.

---

(١) من أروع امثلة التيسير على الناس في الحج

(٢) صحيح البخاري كتاب الحج ح ١٧٣٧.

## سەرپشك كردن لە كڕین و فرۆشتندا[١]

٩٧- {عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «البَيْعَانِ بالخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقا، «أَوْ قَالَ: حَتَّى يَتَفَرَّقا» فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا، مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا»}[٢]

واته: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كڕیارو فرۆشیار سەرپشكن مادام لێك جیانەبووبنەوە، «یان فەرمووی: تا لێك جیادەبنەوە» ئەگەر ڕاستگۆو ڕوون بوون، بەرەكەت دەكەوێتە مامەڵەیانەوە، وە ئەگەر درۆیان كردو فێڵیان كرد، ئەوە بەرەكەتی مامەڵەكەیان دەڕوات.

## مانای سەلەمی حەڵاڵ چیە؟[٣]

ئاسانترین وێنەی سەلەم: بازرگانێك دێ بە جوتیارێك دەڵێ: من دەفتەرێك دۆلارت دەدەمێ، تۆ كە لە هاوین دروێنە دەكەی، تەنێك گەنم بدێ، بەڵام جۆری گەنمەكە ئاوا بێ (وەسفی بكات)، ئەنجا لە هەمان مەجلیس ڕێك دەكەون جوتیارەكە پارەكە وەردەگرێ، لە كاتی دیاری كراویش كابرای بازرگان گەنمەكە وەردەگرێ.

---

(١) خیار البیع.

(٢) (صحیح البخاري ح ٢٠٧٩).

(٣) ما معنی السلف الحلال؟

٩٨- {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ بِالتَّمْرِ السَّنَتَيْنِ وَالثَّلَاثَ فَقَالَ: «مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَفِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ»}[١].

**واتە: ئیبنو عەباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە، خەڵکی سەلەمیان دەکرد لە خورمادا بۆ دوو ساڵ و بۆ سێ ساڵ فەرمووی: هەر کەسێك سەلەم لە شتێکدا دەکات، ئەوە با سەلەم لە پێوانەیەکی دیاردا بکات، وە کێشێکی دیاریکراو، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بیکات.**

## ئەو کڕین و فرۆشتنانەی قەدەغەکراون لە پێناو پاراستنی مافەکانی خەڵك[٢]

٩٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَلَقَّوْا الرُّكْبَانَ، وَلا يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلا تَنَاجَشُوا، وَلا يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلا تُصَرُّوا الْغَنَمَ، وَمَنْ ابْتَاعَهَا فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، بَعْدَ أَنْ يَحْلُبَهَا، وَإِنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ سَخِطَهَا رَدَّهَا وَصَاعاً مِنْ تَمْرٍ»}[٣].

**واتە: ئەبو هـوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەرەو ڕووی قافڵەو کاروانی مەچوون (تا لە دەرەوەی شار مامەڵەیان لەگەڵ بکەن و، لە کاتێکدا ئەوان بێئاگان لە نرخی بازار)، وە با هەندێکتان مامەڵە لە سەر مامەڵەی هەندێکتان نەکات، وە نرخی شت لەسەر یەکتر**

---

(١) صحيح البخاري ح ٢٠٨٦، واخرجه الترمذي في سننه، ثم قال حديث ابن عباس حسن صحيح والعمل على هذا عند اهل العلم من اصحاب النبي وغيرهم اجازوا السلف في الطعام والثياب وغير ذلك مما يعرف حده وصفته (سنن الترمذي ح ١٣١١)

(٢) البيوع المنهية عنها ضمانا لحقوق الناس.

(٣) (صحيح البخاري ح ٢١٥٠).

بەرز مەکەنەوە، (واتە: کەسێك بەبێ ئەوەی نیازی کڕینی هەبێ نرخی کاڵاکە بەرز بکاتەوە)، وە با شار نشینێك (وەکو دەڵاڵ) شتو ومەك بۆ گوند نشینێك نەفرۆشێ، وە گوانی حوشترو مەڕو ماڵات مەبەستن (بۆ ئەوەی شیری زۆری بێتێ لە کاتی فرۆشتن) هەر کەسێك ئەوەی کڕی (واتە: ئەو جۆرە مەڕو ماڵاتانە) دوو ڕێگای لە بەردەمدایە دوای ئەوەی کە دۆشی، ئەگەر ویستی ئەوە با بیهێڵێتەوە، وە ئەگەر ویستی با بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، لەگەڵ صاعێك خورمادا (لە بری ئەو شیرەی دۆشیویەتی).

١٠٠- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرَةِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا}[١]

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە کڕین و فرۆشتنی بەروبووم هەتا پێ دەگات.

١٠١- {وعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنِ ابْتَاعَ طَعَامَاً فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ»}[٢]

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خواردنێکی کڕی، با نەیفرۆشێ هەتا وەریدەگرێ.

١٠٢- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تَبِيعُوا مِنْهَا غَائِبًا بِنَاجِزٍ»}[٣]

---

(١) (صحيح البخاري ح ١٤٨).

(٢) (صحيح البخاري ح ٢١٣٦).

(٣) (صحيح البخاري ح ٢١٧٧).

واتە: ئەبو سەعید خودریی ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن مەگەر وەك یەك بن، فەزڵی هەندێکیان مەدەن بەسەر هەندێکیاندا، زیو بە زیویش مەفرۆشن مەگەر وەك یەك بن، وە لەوانەدا کڕین و فرۆشتنی دوورو نادیار بە حازر مەکەن.

## مامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ[1]

١٠٣- {عَنْ عَائِشَـــةَ رَضِـيَ اللّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اشْتَرَى طَعَامًا مِــن يَهُودِيّ إِلى أَجَلٍ وَرَهَنَهُ دِرْعَاً مِنْ حَدِيدٍ}[2]

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ خواردنێکی لە جوولەکەیەك کڕی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، قەڵغانێك کە لە ئاسن بوو بە بارمتە لای دانا.

١٠٤- {وَعَنْ عَبْدِاللّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ عَامَلَ خَيْبَرَ بشَطْرِ ما يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ}[3]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی کرد لەگەڵ خاوەن زەویەکانی خەیبەر، بە نیوەی بەروبووم یان کشتوکاڵەکەی.

---

(١) التعامل المالي مع غير المسلمين على عهد النبـي ﷺ.

(٢) (صحيح البخاري ح ٢٣٨٦).

(٣) (صحيح البخاري ح ٢٣٢٨).

# هەندێ لە حوکمەکانی خواردن و خواردنەوە[1]

بنچینە لە خواردنەکاندا حـەڵاڵییە، جگە لەوانەی کە دەقێك هاتووە بە قەدەغەکردنیان[2]

خوا دەفەرموێ: ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ﴿١٥٧﴾﴾الأعراف
واتە: (شتە) خراپ و زیانبەخشەکانیان لێ قەدەغە دەکات.



---

(١) بعض احكام الأطعمة والأشربة.

(٢) وان الأصل في المطعوم الحل سوى ما ورد فيه نص بالتحريم. (عقاب، والبازي، والصقر، والشاهين، والبومة).

١٠٥- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ}[١]

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە خواردنی هەر کام لە گۆشتی دڕندەی کەڵبەدار، وە پەلەوەرو باڵداری چڕنووکدار.

## مردارەوەبووی دەریا پاکە

خوا دەفەرمویٚ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ﴾ [٩٦] المائدة[٢].

واتە: (ڕاوکردنی) نێچیری دەریاو خواردنەکەیتان بۆ حەڵاڵ کراوە.

١٠٦- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ»}[٣]

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (دەریا) ئاوەکەی پاکە، مردارەوە بووشی حەڵاڵە.

---

(١) (صحيح مسلم ح ١٩٣٣).

(٢) قوله تعالى: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ﴾ [٩٦] المائدة.

(٣) رواه الشافعي وأصحاب السنن، وصححه البخاري والترمذي وكثير من الحفاظ فنقل البيهقي في معرفة السنن والاثار، أن البخاري قد صَحَّحَهُ ١/٢٣٠، وكذلك قال الترمذي حسن صحيح (سنن الترمذي ح ٦٩)، وقال ابن حجر في ترجمة الراوي المغيرة بن أبي بردة (وصحّح حديثه عن أبي هريرة في البحر: ابن خزيمة، وابن حبان، وابن المنذر، والخطابي، والطحاوي، وابن منده، والحاكم، وابن حزم، والبيهقي، وعبد الحق، وآخرون (تهذيب التهذيب ١٠/ ٢٥٧).

## گۆشتی مریشك و كەروێشك لە خواردنە پاكەكانن[١]

خوا دەفەرموێ: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴿١٥٧﴾﴾الأعراف.

واتە: شتە باش و بە سوودەكانیان بۆ حەڵاڵ دەكات.

١٠٧- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَنْفَجْنَا أَرْنَبًا، وَنَحْنُ بِمَرِّ الظَّهْرَانِ فَسَعَى الْقَوْمُ فَلَغِبُوا فَأَخَذْتُهَا فَجِئْتُ بِهَا إِلَى أَبِي طَلْحَةَ، فَذَبَحَهَا فَبَعَثَ بِوَرِكَيْهَا، أَوْ قَالَ بِفَخِذَيْهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَبِلَهَا}[٢]

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پەلاماری كەروێشكێكماندا ئێمە لە (مَرُّ الظَّهْرَانِ) بووین، خەڵكەكە بۆی چوون نەیانتوانی بیگرن، منیش ڕۆیشتم و گرتم و هێنام بۆ لای ئەبو طەڵحە، ئەویش سەری بڕی و ڕانەكەی، یان سمتەكەی بە مندا نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش وەریگرت.

١٠٨- {عَنْ زَهْدَمِ بْنِ مُضَرِّبٍ الْجَرْمِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ، فَدَعَا بِمَائِدَةٍ، وَعَلَيْهَا لَحْمُ دَجَاجٍ، فَدَخَلَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَيْمِ اللَّهِ، أَحْمَرُ، «شَبِيهٌ بِالْمَوَالِي» فَقَالَ: هَلُمَّ، فَتَلَكَّأَ فَقَالَ: هَلُمَّ، فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ مِنْهُ}[٣]

واتە: زەهدەمی كوڕی موضەریبی جەرمی ﷺ دەڵێ: ئێمە لەلای ئەبو موسای ئەشعەری بووین ﷺ، داوای سفرەیەكی كرد، گۆشتی مریشكی لەسەر بوو، پیاوێكی سوور لە نەوەكانی (تَيْمِ اللَّهِ) هاتە ژوورەوە گوتی:

---

(١) لحوم الدجاج والأرنب من الطيبات، وقوله تعالى: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف

(٢) (صحيح البخاري ح ٥٢١٥).

(٣) (صحيح البخاري ح ٣٤٨٥).

بیهێنن، کەمێك دواکەوت، پاشان گوێی بیهێنن، من بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دەخوارد.

## ئارەق و سەرجەم سەرخۆشکەرەکان خواردنەوەیان حەرامە[1]

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُواْ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٩٢﴾ ﴾المائدة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە دڵنیایی یەوە (بزانن کە) شەڕاب و قومارو بتەکان و زەڵەمەکان پیسن لە کردەوەی شەیتانن، دەجا لێیان دووربکەنەوە بەڵکو سەرفرازبن. بێگومان شەیتان دەیەوێ لە میانەی مەیخۆریی و قومار کردنەوە، دوژمــنایەتیی و بوغـــزو غەرەزتان بخاتە نێوان، وە لە یادی خواو نوێژ بتانگێڕێتەوە، جا ئایا دەست هەڵدەگرن!.

فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، وە وریا بن، ئنجا ئەگەر پشتتان هەڵکرد، ئەوە بزانن پێغەمبەرەکەمان تەنیا گەیاندنی ڕوونی (پەیامی خوای) لەسەرە.

---

(١) حرمة شرب الخمور وجميع المسكرات: وقوله تعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾... ﴾المائدة.

١٠٩- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ»}[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر خواردنەوەیەك سەرخۆشکەر بێ حەڕامە.**

---

(١) (صحيح البخاري ح ٥٥٨٥).

# قەدەغەکردنی خوێنی مرۆڤ و بەهەدەردانی ڕووحی مسوڵمان، یان نامسوڵمان بە ناهەق[1]



(١) حرمة دم الادمي وإزهاق روحه بالباطل مسلما كان أو غير مسلم، ﴿مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا ﴾ [٣٢] المائدة.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴿٣٢﴾ ﴾المائدة.

واتە: لە سۆنگەی ئەوەوە، لەسەر وەچەی ئیسڕائیلمان پێویست کرد، کە هەر کەسێك بەبێ کوشتنی کەسێك (لە تۆڵە)دا یان کە خراپەکاربێ لە زەویدا، کەسێك بکوژێ، وەك ئەوە وایە تێکڕای خەڵکی کوشتبێ، وە هەر کەسێکیش یەکێك زیندووبکاتەوە (لە مردن دەربازی بکات) وەك ئەوە وایە تێکڕای خەڵکی ژیاندبێتەوە.

١١٠- {وَعَنْ عَبْداللّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ: «لَنْ يَزَالَ الْمُؤْمِنُ فِـي فُسْحَةٍ مِنْ دِينِهِ، مَا لَمْ يُصِبْ دَمًا حَرَامًا»}[١]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام بڕوادار لە فراوانی (لێخۆشبوونی خوایە) لە دینەکەیدا، مادام تووشی خوێن ڕشتنێکی حەڕام نەبووبێ.

١١١- {عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ: «أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ اَلنَّاسِ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ فِي اَلدِّمَاءِ»}[٢]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم شت لە ڕۆژی دوایی کە لێ پرسینەوەو دادوەری لەسەر دەکرێ: خوێنە (واتە: کوشتن و خوێن ڕشتنە).

---

(١) (صحيح البخاري ح ٦٨٦٢).

(٢) متفق عليه واللفظ لمسلم ح ١٦٧٨.

١١٢- {عَن الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ قَتْلِ مُؤْمِنٍ بِغَيْرِ حَقٍّ»}[١]

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تێکچوونی دونیا لای خوا ئاسانترە لە کوشتنی ئیمانداریك بە ناهەق).

## قەدەغەکردنی کوشتنی نامسوڵمانان[٢]

خوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ ﴾ (١٩٠) البقرة.

واتە: بجەنگن تەنها لە دژی ئەوانەی لە دژتان دەجەنگن، وە دەستدرێژیی مەکەن (چونکە جەنگ کردن لەگەڵ غەیری ئەوانە دەستدرێژییە)

(شيخ المفسرين) پێشەوا تەبەریی بۆچوونی هەموو لێکدەرەوانی قورئانی هێناوەو موناقەشەی کردوون، بە تایبەت پێشەوایانی تابیعین، کە مەشهور بوون بە تەفسیر کردنی قورئان، وە پێی وایە: ئەم بۆچوونە تەواوەو تەرجیحی کردوە کە مسوڵمان جەنگ دەکات تەنها لە دژی ئەو نامسوڵمانەی کە پەلاماری بدات و، لەگەڵی بجەنگێ و بیکوژێ.

١١٣- {عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَنْ قَتَلَ نَفْسَاً مُعاهَدَاً لَمْ يَرَحْ رَائِحَةَ الجَنَّةِ»}[٣]

---

(١) أخرجه إبن ماجه ح ٢٦١٥، وأخرجه الحفاظ كالنسائي والبيهقي وغيرهما، عن غير واحد من الصحابة، بالفاظ متقاربة، وهو حديث حسن.

(٢) حرمة قتل غيرالمسلمين وقوله تعالى: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ ﴾ (١٩٠) البقرة

(٣) (صحيح البخاري ح ٦٩١٤).

واتە: عــەبدوڵڵای کوڕی عــەمڕ (خــوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس کەسێك بکوژی کە پەیمانی لەگەڵ مسوڵمانان هەیە، ئەوە بۆنی بەهەشت ناکات.

## دادوەر کەس و کاری کوژراو سەرپشك دەکات[1]

لە نێوان وەرگرتنی خوێن بایی، یان تۆڵەکردنەوە لە بکوژ

١١٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، إِمَّا أَنْ يُقَادَ وَإِمَّا أَنْ يُفْدَى»}[2]

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك یەکێکی لێ کوژرا، سەرپشکە لە نێوان دوو شت: یان سزای بدات، یان قەرەبوو وەربگرێ.

کۆدەنگی فوقەهاو زانایان لەسەر ئەوەیە: کە دەسەڵات و حکومەتی شەرعی سزای کوژەر دەدات، نەك کەس و کاری کوژراو.

---

(١) أهل القتيل يخيرهم القاضي، بين القبول بالدية أو القصاص من القاتل، وعموم قوله تعالى (والصلح خير) و (ولكم في القصاص حياة يا اولي الألباب)

(٢) (صحيح البخاري ح ٦٤٨٦).

## دادوەری سەربەخۆ و، گوێ گرتن بۆ ئەو دوو لایەنەی کێشەیان هەیە[١]

خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء.

واتە: وە ئەگەر دادوەریتان لە نێوان خەڵکی دا کرد، بڕیار بە دادگەری بدەن.

١١٥- {عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَقَاضَى إِلَيْكَ رَجُلَانِ، فَلَا تَقْضِ لِلْأَوَّلِ، حَتَّى تَسْمَعَ كَلَامَ ٱلْآخَرِ، فَسَوْفَ تَدْرِي كَيْفَ تَقْضِي»، قَالَ عَلِيٌّ: فَمَا زِلْتُ قَاضِيًا بَعْدُ}[٢]

واتە: عەلی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر دوو کەس کێشەی خۆیان هێنایە لات، دادوەری بۆ یەکەمیان مەکە، تاکو گوێ لە ئەوەی دیکە دەگری، ئەو کات (بۆت دەردەکەوێ و) دەزانی چۆن دادوەری دەکەی، عەلی دەڵێ: دوای ئەوە بەو شێوەیە دادوەرییم دەکرد.

١١٦- {حَدِيث عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فِي شَأْنِ المَرْأَةِ المَخْزُومِيَّةِ، مَرْفُوعًا: «إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ، أَقَامُوا عَلَيْهِ الحَدَّ»}[٣]

---

(١) القضاء المستقل وقوله تعالى ﴿ وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء، الاستماع إلى طرفي النزاع

(٢) سنن الترمذي ح ١٣٣١، وقال: حديث حسن.

(٣) (صحيح البخاري ٦٥٩٣).

واتە: فەرموودەی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەربارەی ئافرەتێکی مەخزومی (کە دزی کردبوو) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ (فەرموویەتی): ئەوانەی پێش ئێوە بەوە فەوتان کاتێك گەورەو ناودارێان دزی دەکرد وازیان لێ دەهێنا، وە کاتێك بێهێزێکیان دزی دەکرد حەددیان لێ دەردەکرد.

## دادوەر کە بڕیار دەردەکات پێویستە ئارام و بە ئاگا بێ[1]

١١٧- {عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ»}[2].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ، دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: با هیچ کامتان بڕیار لە نێوان دوو کەسدا نەدات لە کاتێکدا، کە تووڕەیە.

پێشەوا شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، گوتوویەتی: مەبەست لێرەدا ئەوەیە: سەرقاڵ بوون و تەشویش بوونی دادوەرە، کەواتە: ئەگەر تینووی بێ، یان برسی بێ، نابێ لەو کاتانەدا بڕیاری کۆتایی بدات، تاکو ئاو دەخواتەوەو نان دەخوات.

---

(١) اصدار قرار الحكم عندما يكون القاضي مستجمع العقل غير مشوش الذهن.

(٢) (صحيح البخاري ح ٦٧٣٩).

## هەندێ جار تۆمەتبار، بێ تاوان دەردەچێ، خۆشی چاك دەزانێ ئەو تاوانبارە[١]

١١٨- {عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوٍ مِمَّا أَسْمَعُ مِنْهُ، فَمَنْ قَطَعْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا، فَلاَ يَأْخُذْهُ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ بِهِ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ»}[٢].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێوە کێشەتان دێننە لای من، ڕەنگە هەندێکتان زمانی پاراوتر بێ لە هەندێکی دیکە بۆ بەڵگەهێنانەوە، منیش لەسەر ئەوەی دەیبیستم بڕیاری بۆ دەدەم، جا هەر کەسێك شتێك لە مافی براکەیم پێیدڵ با وەرینەگرێ، چونکە بەشێك لە ئاگری بۆ دەبڕم و پێ دەدەم.

## بەڵگە بۆ ئەو کەسەیە کە بانگەشە بۆ شتێك دەکات (هی ئەوە)[٣]

١١٩- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لاَدَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ، وَلَكِنَّ الْيَمِينَ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ»}[٤].

---

(١) قد يخرج المتهم بريئا وهو يعلم في قرارة نفسه انه مذنب.

(٢) متفق عليه وهذا لفظ مسلم في صحيحه كتاب الأقضية ح ٣٣٢٣. قد يكون الحكم غير صحيح بسبب فصاحة المتهم او محاميه (الحن بحجته) أو شهادة زور أوعجز المدعي من إثبات دعواه

(٣) البينة للمدعي.

(٤) (صحيح مسلم ح٤٥٦٧).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەرچی خەڵك داوای دەکات پێی درابووایە، ئەوە خەڵك داواو بانگەشەی خوێنی پیاوان و ماڵەکانیشیان دەکرد، بەڵام سوێند لەسەر ئەو کەسەیە کە داوای لەسەرە.

## شایەد نابێ شایەدیەکەی بشارێتەوە، پێویستە ڕاستگۆ بێ لە شایەتیداندا، وە نابێ زیان لە شایەدەکان بدرێ[1]

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ ﴿٢٨٣﴾﴾ البقرة.

واتە: شایەدیەکان مەشارنەوەو پەنهانی مەکەن، وە هەر کەسێکیش شایەدیی پەنهان بکات و نەیڵێ، بە دڵنیایی دڵی تووشی گوناهو خراپە بووە.

١٢٠- {عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ»؟ «ثَلاثاً» قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ»، وَكَانَ مُتَّكِئاً فَجَلَسَ، وَقَالَ: «أَلاَ وَقَوْلُ الزُّورِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ»، فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ}[2].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار فەرمووی: ئایا هەواڵتان پێنەدەم بە گەورەترینی گوناهەکان؟ گوتمان: با، ئەی

---

(١) عدم كتمان الشاهد لشهادته والصدق في الشهادة وعدم الإضرار بالشهود، وقوله تعالى: ﴿وَلَا يُضَارَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ ﴿٢٨٢﴾﴾ البقرة، وقوله تعالى: ﴿وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ ﴿٢٨٣﴾﴾ البقرة

(٢) (صحيح البخاري ح ٥٩٧٦).

پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانان، وە ئەزیەتدانی دایك و باوك (بە گوێڕایەڵی نەکردن و سووك تەماشا کردن و حیساب بۆ نەکردن و، ئازاردانی دڵیان)، پاڵی دابۆوە دوایی دانیشت، فەرمووی: ئاگاداربن! وە قسەی درۆ و شایەدیدانی درۆ، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە، هەتا گوتمان: خۆزگە چی دیکە دووبارەی نەکردبایەوە و بێ دەنگ بووبایە، (واتە: ئەوەندە خۆی ئەزیەت نەدابا).

# بنەمای حوکم و سیاسەت و دادپەروەری و ڕاوێژ و هەست کردن بە بەرپرسیارێتی بەرانبەر خەڵکی: سەرچاوەی حوکمی دادپەروەرانە و سیاسەتی ژیرانەیە[1]



---

(١) مبادئ الحكم والسياسة، العدل والشورى والشعور بالمسؤولية تجاه الناس، أساس الحكم العادل والسياسة الرشيدة، وقوله تعالى: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ ﴿٩٠﴾ ﴾النحل، وقوله تعالى: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾ الشورى.

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ ﴿٩٠﴾ ﴾النحل.

واتە: بێگومان خوا فەرمان دەکات بە دادگەری و چاکەکاریی.

هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾الشورى.

واتە: (بڕواداران) کاروباریان بە پرس و ڕاوێژە لە نێوان خۆیاندا.

١٢١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: الإِمَامُ الْعَادِلُ،...}(١)

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەوت جۆرە کەس لە ژێر سێبەری خوان، لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نیە، جگە لە سێبەری خۆی، (یەکێکیان بریتیە لە) پێشەوای دادگەر...

١٢٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ: سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّكُمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالإِمَامُ رَاعٍ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»}(٢)

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کامێك لە ئێوە چاودێرەو، بەرپرسیاریشە بەرانبەر کۆمەڵگاو دەوروبەرەکەی، وە پێشەواو کاربەدەست چاودێرەو، بەرپرسیاریشە بەرانبەر کۆمەڵگاو دەوروبەرەکەی.

---

(١) (صحيح البخاري ح ٦٦٠).

(٢) (صحيح البخاري ح ٢٤٠٩).

## ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی خەڵك و نەرمونیان بوون لەگەڵیان

لەوانەش دوورخستنەوەی سەپاندنی سنوورەکان (سزاکان) بە گومانەکان، هەروەك زۆرینەی زانایان لەسەری یەکدەنگن.[1]

١٢٣- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «اللَّهُمَّ مَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا، فَشَقَّ عَلَيْهِمْ، فَاشْقُقْ عَلَيْهِ، وَمَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا، فَرَفَقَ بِهِمْ، فَارْفُقْ بِهِ»}[2]

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە هەر کەس شتێك لە بەرپرسیارێتی ئوممەتەکەم دەگرێتە ئەستۆی و لەسەریان گرانی دەکات، لەسەری گران بکە، وە هەر کەس شتێك لە بەرپرسیارێتی ئوممەتەکەم دەگرێتە ئەستۆی و لەسەریان ئاسانی دەکات، لەسەری ئاسان بکەیت.

---

(١) رعاية مصالح الناس والرفق بهم ومنها درء الحدود بالشبهات كما اتفق الجمهور

(٢) (صحيح مسلم ١٨٢٨)، وقد نقل الإجماع على درء الحدود بالشبهات ابن المنذر، وقد بوب عليه كثير من اهل العلم المتقدمين أصحاب المصنفات والسنن كالترمذي والبيهقي وابن ماجة وابن أبي شيبة، ولم نعلم من اهل العلم المتقدمين من قال بخلاف ذلك، وقال العلامة المباركفوري في تعليقه على سنن الترمذي: ما في الباب وإن كان فيه المقال المعروف فإنه يصلح للاحتجاج به على مشروعية درء الحدود بالشبهات المحتملة...وهذا الذي ذكرهوالمباركفوري والعلماء من قبله إحوط للحاكم وارفق بالناس و أن يخطئ السلطان في العفو خير من أن يخطئ في العقوبة وحديث ادرؤوا الحدود بالشبهات يتأيد بأحاديث صحيحة كثيرة عنه عليه الصلاة والسلام انه كان يدفع تنفيذ العقوبات بالشبهات.

## حـوكم
## ئەمانەت و تاقیکردنەوەیە

**ئاگادارکردنی کەسی لاواز لە گرتنەدەستی ئەمانەتی حوکم، وە کەراهەتی سوربوون لەسەر ئەمانەتی حوکم[1]**

١٢٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ: «إِنَّكُمْ سَتَحْرِصُونَ عَلَى اَلْإِمَارَةِ، وَسَتَكُونُ نَدَامَةً يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ، فَنِعْمَ اَلْمُرْضِعَةُ، وَبِئْسَتِ اَلْفَاطِمَةُ»}[2]

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە دڵنیایی لە داهاتویەکی نزیکدا سوور دەبن لە سەر گرتنەدەستی دەسەڵات، بێگومان ئەو دەسەڵاتەش دەبێتە مایەی پەشیمانی لە ڕۆژی دواییدا، خۆشترین سەرەتا و، خراپترین کۆتاییە بۆتان)[3].**

---

(١) الحكم أمانة واختبار وتحذير التقي الضعيف من تولي مسؤولية امانة الحكم، وكراهة الحرص على الإمارة.

(٢) (صحيح البخاري ح ٦٧٢٩).

(٣) (واتە: چاکترین دەستکەوتی دنیایە لە بەدەستهێنانی دەسەڵات و ماڵ و سامان و جێبەجێکردنی فەرمان و بەدەستهێنانی خۆشی لەزەتی دنیا، وە خراپترین دەرنجامیشی هەیە کاتێ دەسەڵاتەکە تەواو دەبێ و نامێنێ بە مردن یان هەر شێوەیەکی دیکە، چونکە لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ).

## پێویستە لەسەر خاوەن دەسەڵاتی دادوەر:

## خەڵکی خاوەن توانا و سپاردە پارێز هەڵبژێرێ، وە خەڵکی خراپ لە خۆی دووربخاتەوە[1]

١٢٥- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا اسْتُخْلِفَ خَلِيْفَةٌ إلاَّ لَهُ بطَانَتَانِ: بطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بالخَيْرِ وتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بالشَّرِّ وتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، والمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللَّهُ»}[2]

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێك نەکراوە بە جێنشین (دەسەڵاتدار، لێپرسراو)، مەگەر دوو هاوەڵی دەبن، هاوەڵێك فەرمانی پێدەکات بە خێر و چاکە وە هانیشی دەدات لەسەر چاکەکاریی، وە هاوەڵێك فەرمانی پێدەکات بە خراپە و هانی دەدات لەسەر خراپەکاریی، پارێزراویش ئەو کەسەیە خوا پاراستوویەتی.

## مافە ئاساییەکانی مرۆڤ

لە ژیانێکی خۆش و دابینکردنی پێویستیەکانی ڕۆژانە لە ئاوو وزەو جگە لەوانە، وە فەرموودەی: (خەڵکی بەشدارن لە سێ شت)[3]

---

(١) على الحاكم أن يختار البطانة الصالحة من اصحاب الكفاءات وأصحاب الامانة ويبعد البطانة السيئة عن مجلسه.

(٢) (صحيح البخاري ٦٦١٢).

(٣) حقوق الانسان المادية في العيش الرغيد وتوفير مستلزمات الحياة اليومية من ماء وطاقة وغير ذلك وحديث (الناس شركاء في ثلاث).

١٢٦- {عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُسْلِمُونَ شُرَكَاءُ فِي ثَلاَثٍ الْمَاءِ وَالْكَلَإِ وَالنَّارِ»}[1]

واتە: یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمانان هاوبەش و بەشدارن لە سێ شت: ئاو، پەرێز، ئاگر.

لەم سەردەمەی ئێستاماندا وشەی: (النار) وزە دەگرێتەوە.

---

(١) - وقال الامام الشوكاني في الفتح الرباني (٨/٣٧٦٨) هذا حديث ثابت باسناد صحيح، وقال الاستاذ محمد فؤاد عبد الباقي رحمه الله في الزوائد هذا إسناد صحيح ورجاله موثقون. لأن محمد بن عبد الله بن يزيد أبا يحيى المكي وثقه النسائي وابن أبي حاتم وغيرهما. وباقي رجال الإسناد على شرط الشيخين. فمن واجب الدولة ان توفر الطاقة اللازمة لاعداد الطعام والتدفئة والقدر الضروري من استخدامه لوسائل النقل بلا مقابل وما زاد عن الا حتياجات الضرورية فله شأن آخر وكذلك توفير المياه الصالحة للشرب في البيوت وغيرها من المرافق العامة بلا مقابل مالي وقد حرص رسول الله ﷺ على توفير المياه الصالحة لشرب اهل المدينة جميعا.

# دابەش کردنی سەرووەت و سامانەکان بە دادپەروەری و یەکسانی[1]

خوا فەرموویەتی: ﴿كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۝٧﴾ الحشر.

واتە: بۆ ئەوەی ئەو ماڵ و سامانە تەنیا لە دەستی دەوڵەمەندەکانتاندا نەبێ.



---

(١) توزيع الثروة بالعدالة والمساواة، وقوله تعالى: ﴿كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۝٧﴾ الحشر، وعلى الدولة ان تجعل لكل فرد في المجتمع راتبا سنويا من ثروات البلاد بعدد افراد اسرته (العطاء السنوي)، بل على الدولة اداء دينه بعد مماته وتخفيف اللعبء عن عائلته.

## لە ئەرکەکانی دەوڵەت ئەوەیە: هەر تاکێکی کۆمەڵگا بمرێ و قەرزی لە ئەستۆ بێ و، نەبوون بێ، پێویستە قەرزەکەی بگرێتە ئەستۆ

١٢٧- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ الْمَيِّتِ عَلَيْهِ الدَّيْنُ، فَيَسْأَلُ: «هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ مِنْ قَضَاءٍ»؟ فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ وَفَاءً صَلَّى عَلَيْهِ، وَإِلاَّ قَالَ: «صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ»، فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْفُتُوحَ، قَالَ: «أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ فَمَنْ تُوُفِّيَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ»}[١]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك پیاوێکی مردوو دەهێنرا، قەرزی لەسەر بووایە دەیپرسی: ئایا شتێکی بەجێهێشتووە قەرزەکەی پێ بداتەوە؟ ئەگەر گوترابا: (بەڵێ)، نوێژی لە سەر دەکرد، وە ئەگەر گوترابا: (نەخێر)، دەیفەرموو: نوێژ لە سەر هاوەڵەکەتان بکەن، کاتێك خوا دەرووی لێکردەوەو باری ئابووری باش بوو، فەرمووی: من لە پێشترم بۆ هەموو بڕواداران لە نەفسی خۆیان، هەر کەس مردوەو، قەرزی بەجێهێشتووە من بۆی دەدەمەوە، هەرکەسیش ماڵ و سامانی بەجێهێشتووە با بۆ میراتگرەکانی بێ.

---

(١) (صحيح مسلم ح ١٦١٩).

## لە ئەرکەکانی دەوڵەت ئەوەیە سوپایەکی بەهێز ئامادە بکات

بۆ بەرگری کردن لە خەڵك و لە سنوورەکانی وڵات و ترسـاندنی ئەو دوژمنانەی لە مەڵاسدان تا چاویان تێنەبڕن[1]

خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ ﴿٦٠﴾﴾ الأنفال.

واتە: وە هەرچی لە تواناتاندا هەیە ئامادەی بکەن بۆ بەهێزکردنی سوپا

١٢٨- {عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا، قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»}[2]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: هەر کەس لە پێناوماڵەکەیدا بکوژرێ شەهیدە.

١٢٩- {عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللّٰه ﷺ يَقُولُ: «مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»}[3]

واتە: سەعیدی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەس لە پێناو خێزان (و کەس و کاری) بکوژرێ شەهیدە،

---

(١) من واجبات الدولة تهيئة جيش قوي للدفاع عن العباد وعن حدود البلاد وثغورها واخافة العدو المتربص كي لا يطمع فيهم، وقوله تعالى: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ ﴿٦٠﴾﴾ سورة الأنفال واعداد الجيش للدفاع عن الحدود والاعراض والانفس والأموال ... ويعتبر ذلك جهادا).

(٢) (صحيح البخاري ح ٢٣٤٨).

(٣) سنن الترمذي ح ١٤٢١، وقال أبو عيسى: هذا حديث حسن صحيح.

هەر کەس لە پێناو خوێنی خۆی بکوژرێ شەهیدە، هەر کەس لە پێناو دینەکەی بکوژرێ شەهیدە، هەر کەس لە پێناو ماڵ و منداڵی بکوژرێ شەهیدە.

## ژیانی ئاشتیخوازانە لە نێوان مسوڵمانان و نامسوڵمانان

وە پاراستنی گیان و ماڵی نامسوڵمـانـان، جا بنچینە لەوەدا بریتیە لە پێکەوە ژیان و مامەڵەی چاك و تەندروست[1]

خوا دەفەرموێ: ﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾المتحنة.

واتە: دڵنیابن خوا نەهی ئەوەتان لێناکات کە چاکەکارو دادگەربن لەگەڵ ئەوانەدا کە جەنگیان لە دژ نەکردوون و دژایەتی ئاینییان نەکردوون، وە لە شوێنی خۆتان دەریان نەکردوون، بێگومان خوا دادگەرانی خۆش دەوێن.

١٢٠- حوزەیفە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: وەفدی نەجران (کە نەصرانی بوون) هاتن بۆ مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، دوای گفتوگۆ کردن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، دوایی پێیان گوت: {إِنَّا نُعْطِيكَ مَا سَأَلْتَنَا، وَابْعَثْ مَعَنَا رَجُلاً أَمِيناً...، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قُمْ يَا أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ، ثُمَّ قَالَ: هَذَا أَمِينُ هَذِهِ الْأُمَّةِ}[2].

---

(١) التعايش السلمي بين المسلمين وغير المسلمين في المجتمع والمحافظة على ارواح غير المسلمين وممتلكاتهم، فالأصل هو التعايش والمعاملة بالبر والحسنى، وقوله تعالى: ﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ المتحنة.

(٢) (صحيح البخاري ح ٤٣٨٩).

واتە: ئەوەی لێمان داوا دەکەی پێت دەدەین، تۆش پیاوێکی ئەمیندارمان لەگەڵ ڕەوانە بکە ...، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەڵسە ئەی ئەبو عوبەیدەی جەڕڕاح، پاشان فەرمووی: ئەوە ئەمینداری ئەم ئۆممەتەیە.

پوختەی ئەم بەسەرهاتە، ئەوەیە: ئەوان کە نەصڕانی بوون، هاتوون لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێککەوتن، لەسەر ئەوەی دراوسێی باش بن و هەندێك لە ماڵی خۆشیان بدەن وەك مەرجێك بۆ صوڵح و ئاشتەوایی کردنیان و پێکەوە ژیانی ئاشتیانە، وە داوایان لێکرد کە پیاوێکیان لە هاوەڵانی لەگەڵ بنێرێ دەستپاك و ئەمیندار بێ، ئەو ماڵ و سامانە کۆبکاتەوە کە لەسەری ڕێککەوتبوون، وە بە دادگەری مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، لەبەر ئەوە، ئەوان لە نێوان خۆیان پەرتەوازە بوون و کێشەیان هەبوو.

جا پێش ئەم ڕووداوە بە چەند ساڵێك پێغەمبەر ﷺ جەختی کردوە لەسەر ئەوەی، ئەو کەسانەی لاوازو بێ دەسەڵاتن با بچن بۆ خاکی حەبەشە، کە ئەو کات دەسەڵاتداری حەبەشە نەصڕانی بوو، پیاوێکی دادگەری نەصڕانی بوو حوکمی دەکردن، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بە مسوڵمانانی فەرموو: لە خاکی حەبەشە پادشایەکی لێیە ستەم لە کەس ناکات، بڕۆن بۆ وڵاتەکەی تا خوا دەرووتان لێدەکاتەوە[1].

وە هەروەها (إبن القيم الجوزية) دەڵێ: بە صەحیحی هاتوە کە ئەم وەفدە لە مزگەوت نوستوون، وە تا بەیانیش خەریکی صەڵات و عیبادەتی خۆیان بوون لەسەر دینی نەصڕانی، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هیچ جۆرێك

---

(١) أخرجه البيهقي في سنن الكبرى ح ١٨١٩٠، إسناده صحيح.

قەدەغەی نەکردوون، ڕێگەی لێنەگرتوون، ئەم ساڵە، ساڵی وەفدەکان بوو، دەڵێ: خەڵك ویستیان ڕێگەیان نەدەن لە مزگەوت بمێننەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وازیان لێ بێنن، ئەوانیش ڕوویان لە ڕۆژهەڵات کردو، دەستیان بە نوێژی خۆیان کرد[1].

---

(١) أحكام أهل الذمة: ج١، ص٣٩٧. زاد المعاد في هدي خير العباد ج٣، ٥٤٩، ط مؤسسة الرسالة.

# ژیانی خێزانی و هەندێ لە حوکم و ئادابەکانی[1]

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾الحجرات.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لە نێرو مێ یەك هێناوەتەدی، (واتە: باب و دایکێك)، دوایی گێڕامانن بە چـــەند گـەل و هۆزێك، تاکو پێك ئاشنابن، پێکەوە هاوکار بن، بەڕێزترینتان لەلای خوا پارێزکارترینتانە، بێگومان خوا زانای شارەزایە.



---

(١) الحياة الأسرية وبعض احكامها وآدابها.

## هاندان لەسەر هاوسەرگیری

### پێکهێنانی خێزان و خۆبەهێزکردن لە ڕووی توانا[١]

١٣١- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ»}[٢]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵی گەنجان! هەر کەس لە ئێوە توانای هەیە با ژن بێنێ.

مەبەست لە توانا لێرەدا: توانای ماددیی و، هێزی جەستەو، تەواوی عەقڵ و، ئامادەیی دەروونیشە.

### دینداریی و ڕەوشت بەرزی ئافرەت پێش جوانی و ماڵ و سامان دەخرێ[٣]

١٣٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ، تَرِبَتْ يَدَاكَ»}[٤]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت لەبەر چوار شت مارە دەکرێ: لەبەر ماڵ و دارایی، لەبەر

---

(١) الحث على الزواج وبناء الأسرة والتمكن من الباءة.

(٢) (صحيح البخاري ح ١٩٠٥).

(٣) تدين المراة وحسن خلقها مقدم على الجمال والمال.

(٤) (صحيح البخاري ح ٥٠٩٠).

بنەماڵەو ڕەچەڵەکی، لەبەر جوانی، لەبەر ئاینی، دەست بگرە بە خاوەن ئاینەوە، دەستت بەخۆڵدا بچێ (واتە: هەژار بکەوی).

## کچ مافی هەڵبژاردنی هەیە لەڕووی شەرعەوە، وە ڕازی بوون بەو کەسە داخوازی کردوە[1]

١٣٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ، قَالَ: «لاَ تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّهِ وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: «أَنْ تَسْكُتَ»}[2]

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن مارە ناکرێ تا پرسی پێنەکرێ، کچ مارە ناکرێ تا مۆڵەتی لێوەردەگیرێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەت لێوەرگرتنی چۆنە؟ فەرمووی: بێدەنگ بوونیەتی، (چونکە هەندێ جار کچ شەرم دەکات بڵێ دەمەوێ شوو بە فڵان کەس بکەم).

## بەرەکەت لە ئاسان کردنی مارەییەکاندایە[3]

خوا فەرموویەتی: ﴿ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً ﴿٤﴾ ﴾النساء.

واتە: مارەیی ئافرەتان مافێکی ڕەوای خۆیانە، لەسەر مێرد پێویستە (دابینی بکات و) پێیان بدەن.

(١) الفتاة لها حق الاختيار شرعا والرضا بالمتقدم لخطبتها.

(٢) (صحيح البخاري ح ٥١٣٦).

(٣) البركة في يسر المهور، وقوله تعالى: ﴿ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً ﴿٤﴾ ﴾ النساء.

١٣٤- {عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ اَلصَّدَاقِ أَيْسَرُهُ»}[1]

واتە: عوقبەی کوڕی عامرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین و بە بەرەکەتترین مارەیی ئەوەیە کەم بێ ( و ئەرکی خێزان قورس نەکات).

زۆربەی زانایان لەسەر ئەو بۆچوونەن: باوکی کچ بۆی نیە پارەی کچەکە بخوات.

## خاوەندارێتی بۆ پاراستنی مافەکانی ئافرەتە لە کاتی هاوسەرگیری نەك بۆ تەسککردنی ئازادیەکانی[2]

١٣٥- {عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ»}[3].

---

(١) (أخرجه الحاكم في المستدرك ح ٢٧٤٢، وقال صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه، وقال ابن كثير اسناده جيد (إرشاد الفقيه ١٧١/٢).

(٢) ولي الأمر لضمان حقوق المراة عند الزواج وليس لتقييد حريتها.

(٣) هذا حديث مختلف فيه والحديث وقد اختلف العلماء في وصله وإرساله وقد فصل الحافظ ابن حجر ذلك في الفتح فقال (قوله: باب من قال لا نكاح إلا بولي (استنبط المصنف (أي: البخاري) هذا الحكم من الآيات والأحاديث التي ساقها، لكون الحديث الوارد بلفظ الترجمة على غير شرطه، والمشهور فيه حديث أبي موسى مرفوعا بلفظه أخرجه أبو داود والترمذي وابن ماجه وصححه ابن حبان والحاكم، لكن قال الترمذي بعد أن ذكر الاختلاف فيه: وأن من جملة من وصله إسرائيل عن أبي إسحاق عن أبي بردة عن أبيه، ومن جملة من أرسله شعبة وسفيان الثوري عن أبي إسحاق عن أبي بردة ليس فيه أبو موسى رواية، ومن رواه موصولا أصح لأنهم سمعوه في أوقات مختلفة، وشعبة وسفيان وإن كانا أحفظ وأثبت من جميع من رواه عن أبي إسحاق لكنهما سمعاه في وقت واحد، ثم ساق من طريق أبي داود الطيالسي عن شعبة قال: «سمعت سفيان الثوري يسأل أبا إسحاق أسمعت أبا بردة يقول: قال رسول الله ﷺ لا نكاح إلا

واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مارەیی دروست نیە بە بێ سەرپەشتیاری (کچەکە).

پێشەوا ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کۆدەنگە لەگەڵ زۆرینە (جمهور)ی زانایان کە (ولي أمر) مەرجە لە دوو حاڵەت:

یەکەم: ئەگەر باوکی کچەکە، یان برای، یان دادوەر (ئەگەر کچەکە باوك و برای نەبێ) هەست بکات ئەم کوڕە هاوشانی کچەکە نیە.

دووەم: یان هەست بکات فێڵی لێ دەکات، ئەو مارەیی و خەرجیەی بۆی دەکات، شایستە نیە لەگەڵ مارەیی ئەم سەردەمە.

کەواتە: ڕاجیایی نێوان ئەبو حەنیفەو جمهوری زانایان لەوبارەوە ئەوە دەگەیەنێ ویلایەتی ئەمر لەم بابەتەدا بۆ پاراستنی مافی ئافرەتە، نەك بۆ فەرز کردنی ڕەئی باوك و برا بەسەر کچەکە.

---

بولي ؟ قال نعم» قال: وإسرائيل ثبت في أبي إسحاق، ثم ساق من طريق ابن مهدي قال: ما فاتني الذي فاتني من حديث الثوري عن أبي إسحاق إلا لما اتكلت به على إسرائيل لأنه كان يأتي به أتم، وأخرج ابن عدي عن عبد الرحمن بن مهدي قال : إسرائيل في أبي إسحاق أثبت من شعبة وسفيان . وأسند الحاكم من طريق علي بن المديني ومن طريق البخاري والذهلي وغيرهم أنهم صححوا حديث إسرائيل، ومن تأمل ما ذكرته عرف أن الذين صححوا وصله لم يستندوا في ذلك إلى كونه زيادة ثقة فقط، بل للقرائن المذكورة المقتضية لترجيح رواية إسرائيل الذي وصله على غيره).

قلت: والخلاف بين جمهور الفقهاء وأبي حنيفة يؤكد ما قلناه آنفا من ان اشتراط ولي الأمر لضمان حقوق المراة إذ ان أبا حنيفة اتفق معهم على اشتراطه في حالتين الأولى ان يشعر ولي الأمر ان الخاطب ليس كفؤا لبنته وهي لا تدرك ذلك او انه يخدعها فلا يعطيها ما تستحق قيمة المهر كأقران عصرها.

## خەرجی ژن پێویستە لەسەر پیاو[١]

خوا فەرموویەتی: ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ ﴾ النساء[٢].

واتە: پیاوان مشوورخۆری ژنانن لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوا هەندێکیانی (لە هەندێك ڕووەوە) بەسەر هەندێکیاندا هەڵبژاردوەو، بە هۆی ئەوەوە کە پیاوان لە ماڵی خۆیانیاندا خەرج کردوە (بۆ مارەیی و مەسرەفی ماڵ و خێزان).

١٣٦- {عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَنْفَقَ الرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ يَحْتَسِبُهَا فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ»}[٣]

واتە: ئەبو مەسعوود دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاو خەرجی ماڵ و منداڵەکەی کردو چاوەڕوانی پاداشت بوو، ئەوە بۆی بە خێر دەنووسرێ.

کەواتە: خەرج و مەسرەف کێشانی ماڵ و خێزان، لەگەڵ ئەوەی فەرزە لەسەر پیاو، بەڵام لە هەمان کاتدا، خوای گەورە پاداشت و خێریشی بۆ

---

(١) النفقة واجبة على الزوج: وقوله تعالى: ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ ﴾ النساء.

(٢) القوامة لا تعني التسلط وإنما القيام برعاية مصالح من يعول وإدارة شؤونهم ولقد ذكرت الاية بصريح العبارة ان احد أسباب هذه القوامة هو النفقة على الأسرة اما العامل الثاني فجاءت بصيغة العموم ( بما فضل بعضكم على بعض) وهذه اشارة إلى ان الرجل يفوق المراة في أمور وتتفوق عليه في بعض الأمور الخرى كصبرها على تربية الأجيال منذ الصغر وهذه مراعاة كريمة لشعور النساء في كتاب الله نغفل عنها احيانا كثيرة.

(٣) (صحيح البخاري ح ٥٥).

دەنووسێ، یانی: وەك شتێکی سوغره ئاسا نیه، بەڵکو ڕەزامەندی خوای پەروەردگاری تێدایه.

١٣٧- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ اللّهِ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي رَقَبَةٍ، وَدِينَارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ، أَعْظَمُهَا أَجْرًا الَّذِي أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ»}[1]

واته: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دینارێك، كە خەرجی دەكەی لە پێناوی خوا، وە دینارێك كە خەرجی دەكەی بۆ ئازاد كردنی كۆیلەیەك، وە دینارێك كە دەیكەیە خێرو دەیبەخشی بە نەدارێك، وە دینارێك، كە خەرجی دەكەی بۆ خێزانەكەت، ئەوەی كە بۆ خێزانەكەت خەرجكردوە، پاداشتی لە هەموویان گەورەترە.

## دروسته بۆ ژن لە ماڵی مێردەكەی خەرج بكات

بەشێوەیەكی چاك، بەبێ ئەوەی بزانێ، ئەگەر مێردەكەی ڕەزیل بوو[2]

١٣٨- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: دَخَلَتْ هِنْدُ بِنْتُ عُتْبَةَ «امْرَأَةُ أَبِي سُفْيَانَ» عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، لا يُعْطِينِي مِنَ النَّفَقَةِ مَا يَكْفِينِي وَيَكْفِي بَنِيَّ، إلاَّ مَا أَخَذْتُ مِنْ مَالِهِ بِغَيْرِ عِلْمِهِ، فَهَلْ عَلَيَّ فِي ذَلِكَ مِنْ جُنَاحٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُذِي مِنْ مَالِهِ بِالْمَعْرُوفِ مَا يَكْفِيكِ وَيَكْفِي بَنِيكِ»}[3]

---

(١) (صحيح مسلم ح ٩٩٥).

(٢) للمرأة ان تاخذ من مال زوجها بغير علمه بالمعروف لو كان بخيلا.

(٣) متفق عليه، واللفظ لمسلم ح ١٧١٤.

واتە: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ)، هیندی کچی عوتبەی هاوسەری ئەبو سوفیان هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە، هێندەم خەرجی ناداتێ بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات، جگە لەوەی من خۆم لێی دەردێنم و ئەویش پێی نازانێ (واتە: بە پەنهانی)، ئایا لەسەر ئەوە گوناهبار دەبم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە شێوەیەکی پەسند ئەوەندەی بەشی خۆت و، منداڵەکانت دەکات لێی دەربێنە.

## دادپەروەری کردن لە بەخشین لە نێوان منداڵەکان و، فەزڵ نەدانیان بەسەر یەکتر[1]

١٣٩- {عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: تَصَدَّقَ عَلَيَّ أَبِي بِبَعْضِ مَالِهِ، فَقَالَتْ أُمِّي عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: لاَ أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَانْطَلَقَ أَبِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِيُشْهِدَ عَلَى صَدَقَتِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفَعَلْتَ هَذَا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: اتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا فِي أَوْلادِكُمْ، فَرَجَعَ أَبِي، فَرَدَّ تِلْكَ الصَّدَقَةَ»}[2]

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: بابم لە هەندێك لە ماڵەکەی بە دیاری دامێ، دایکیشم کە عومرەی کچی ڕەواحە گوتی: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ شایەد نەبێ لەسەری، بابیشم چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی شایەد بێ لەسەر ئەو ماڵەی بە منی داوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەو کارەت بۆ هەموو منداڵەکانت کردوە؟ گوتی: نەخێر، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: پارێز لە خوا بکەن و،

---

(١) العدل في الانفاق على الأولاد وعدم التفاضل بينهم.

(٢) متفق عليه، واللفظ لمسلم ح ١٦٢٣.

لە نێوان منداڵەکانتان دادگەربن، باوکم گەڕایەوەو دیارییەکەی لێ وەرگرتەوە.

## چاکترین پیاو، ئەو پیاوەیە بۆ هاوسەر و خێزانەکەی چاکە[1]

١٤٠- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لأَهْلِهِ، وَأَنَا خَيْرُكُمْ لأَهْلِي»}[2]

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترینتان باشترینتانن بۆ خاووخێزانەکەی، وە من لە هەمووتان باشترم بۆ خاووخێزانەکەم.

## ڕەچاوکردنی هەستی ئافرەت

حەز کردنی لە خۆڕازاندنەوە، هەروەها لە دوای سەفەرێکی درێژ لەپڕ خۆی نەکات بە ماڵدا[3]

١٤١- {عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللّٰهِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «إِذَا أَطَالَ أَحَدُكُمُ الْغَيْبَةَ، فَلاَ يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلاً»}[4]

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە سەفەرێکیدا زۆری پێچوو با لە شەودا لە پڕ نەچێتە ژوورەوە بۆ لای هاوسەرەکەی.

---

(١) خير الرجال من كان احسنهم لزوجته وعياله.

(٢) أخرجه الترمذي في سننه ح ٣٨٩٥ وقال حسن صحيح.

(٣) مراعاة شعور المراة ورغبتها في التزين، وعدم مباغتتها بعد سفر طويل.

(٤) (صحيح البخاري ١٨٩١).

یانی: پیاو پێویستە خێزانەکەی خۆی ئاگادار بکاتەوە، کەی دەگەڕێتەوە، وە لە پڕ خۆی نەکات بە ژوور، بۆ وێنە: با بڵێ: من لەم بەروارو، لەم ڕۆژە دەگەڕێمەوە کاتژمێر ئەوەندە، چونکە هۆکارەکانی ئاگادار کردنەوە لەم سەردەمە ئاسانترە، وەك جاران نیە.

## پێغەمبەر ﷺ لێدانی ئافرەتانی قەدەغە کردوە

فەرمانی کردوە بە هەڵسوکەوتی جوان و سۆزداری لەگەڵیان[1]

١٤٢- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَجْلِدُ أَحَدُكُمْ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ ثُمَّ يُجَامِعُهَا فِي آخِرِ الْيَوْمِ»}[2]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێکتان لە هاوسەرەکەی نەدات وەك لێدانی کۆیلە، پاشانیش بچێ لە کۆتایی ڕۆژەکەدا، لەگەڵی جووت بێ،

وە هەمان ڕیوایەت لای ئیبنو سەعد هاتوە، دەڵێ: ئایا پیاوێك لە ئێوە شەرم ناکات لە سەرەتای ڕۆژ دەست بەرز بکاتەوە لە خێزانەکەی و، ئێوارەش دەست بکاتە ملی!

١٤٣- {عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ ﷺ، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ طَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ نِسَاءٌ كَثِيرٌ يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ، لَيْسَ أُولَئِكَ بِخِيَارِكُمْ»}[3]

---

(١) نهي النبي عن ضرب النساء وحسن المعاشرة معهن والرفق بهن.

(٢) (صحيح البخاري ح ٤٩٠٨).

(٣) أخرجه أبو داود برقم: ٢١٤٨، صححه الألباني.

واتە: ئیاسی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو زوباب ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمـووی: بە ڕاستی ئافرەتانێك هاتن بۆ لای خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ سکاڵایان لە هاوسەرەکانیان دەکرد کە لێیان دەدەن، ئەوانە کەسانێکی باش نین.

## ئەو هاوسەرگیریەی کە قەدەغەکراوە[1]

١٤٤- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ}[٢]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە ژن بە ژنی بکرێ.

## پیاوان و ئافرەتان بنەمای مرۆڤایەتین و بەشدارن لە چاکەکاریی

١٤٥- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ»}[٣]

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتان نیوەو لەتکی پیاوانن.

---

(١) الأنكحة المنهي عنها.

(٢) (صحيح البخاري ح ٥١١٢)، والشِّغارُ: أن يزوِّجَ الرَّجُلُ ابنَتَه على أن يزوِّجَه الآخَرُ ابنَتَه، ليس بينهما صَداقٌ.

(٣) أخرجه الإمام أحمد في باقي مسند الأنصار من حديث أم سليم بنت ملحان ح ٥٨٦٩، والترمذي في كتاب الطهارة ح ١٠٥، وهو حديث حسن صحيح. وقال العلامة ابن باز رحمه الله تعالى هذا حديث صحيح والمعنى والله أعلم أنهن مثيلات الرجال إلا ما استثناه الشارع، كالإرث والشهادة وغيرهما مما جاءت به الادلة.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر منداڵی خۆشویستوون و ڕێزی گرتوون، بە تایبەت کچەکانی بێ جیاوازی، وە بە شێوەی کرداری پیشانی عەرەبی داوە، ئەو تێگەیشتنەیان هەڵەیە کە خراپ مامەڵە کردن و بە سووک سەیر کردنی ئافرەتە، وە هەروەها فەرموویەتی: {لاَ تَكْرِهُوا الْبَنَاتِ فَإِنَّهُنَّ الْمُؤْنِسَاتُ الْغَالِيَاتُ} (رواه أحمد برقم: ١٦٧٣٣، وَصَحَّحَهُ الألباني). واتە: کچانتان خۆش بوێ، چونکە ئەوان دڵخۆشکەری (خێزان) و بە نرخن.

١٤٦- {عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ؓ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ}[1].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ؓ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی خەیبەر هاوسەرگیری موتعەو، خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی قەدەغەکرد.

## هەندێ لە یاساو ڕێساکانی تەڵاق و خولع[2]

١٤٧- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَتَغَيَّظَ مِنْهُ رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: «لِيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ فَتَطْهُرَ، فَإِنْ بَدَا لَهُ أَنْ يُطَلِّقَهَا فَلْيُطَلِّقْهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ، كَمَا أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ»}[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، هاوسەرەکەی تەڵاقداو لەو کاتەش لە سووڕی مانگانەدا بوو، عومەر (خوا لێی ڕازی

---

(١) (صحيح مسلم ح ٣٤٩٩).

(٢) بعض أحكام الطلاق والخلع.

(٣) (صحيح البخاري ٤٩٠٨).

بێ) ئەوەی باس کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی تووڕە بوو، دوایی فەرمووی: با بیگێڕێتەوەو لای خۆی بهێڵێتەوە تاکو پاك دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتە حەیزەوە و پاك دەبێتەوە، ئنجا ئەگەر ویستی تەڵاقی بدات، با تەڵاقی بدات پێش ئەوەی لەگەڵی جووت بێ، ئەوە عیددەیە، وەك چۆن خوای زاڵی پایەدار فەرمانی پێ کردوە.

١٤٨- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً رَمَى امْرَأَتَهُ، وَانْتَفَى مِنْ وَلَدِهَا فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَتَلاعَنَا، كَمَا قَالَ اللَّه تَعَالَى، ثُمَّ قَضَى بِالْوَلَدِ لِلْمَرْأَةِ، وَفَرَّقَ بَيْنَ الْمُتَلاعِنَيْنِ}[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێك خێزانەکەی تۆمەتبار کرد، گوتی: ئەو منداڵە لە من نیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن نەفرینیان لە یەکدی کرد، وەك خوای بەرز فەرموویەتی، پاشان فەرمانی کرد منداڵەکە بۆ ئافرەتەکە بێ و، ژن و مێردەکەی لێك جیاکردنەوە.

## ئافرەت بەرپرسیارە لە ماڵی مێردەکەی[2]

١٤٩- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا»}[3]

---

(١) (صحيح البخاري ح ٤٤٧١).

(٢) المرأة هي المسؤولة في بيت زوجها .

(٣) (صحيح البخاري ح ٢٤٠٩)، الاسلام دين الوسطية والعدل والتوازن في العلاقات وأنا أرى والله أعلم ان في هذا النص النبوي زورق نجاة لمن حار بين مداراة زوجته وامه فاقول وبالله التوفيق ان طاعة الام واجبة لقوله تعالى ( وبالوالدين إحسانا) وحسن معاشرة الزوجة كذلك لقوله تعالى (وعاشروهن بالمعروف) فعليه والله أعلم أن يبين (أي: الزوج) لزوجته ان طاعة امه واجبة وان يبين

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، بیستوویەتی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: وە ئافرەت بەرپرسیارە لە ماڵی مێردەکەی، وە بەرپرسیاریشە بەرانبەر ئەندامانی خێزان.

## (کۆتایی کتێب)[1]

## ئامۆژگاری خوێنەر بە زۆر یادی خواو سوپاسکردن و بە پاکگرتنی

١٥٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ»}[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو وشە هەن زۆر سووکن لە سەر زمان، گران و قورسن لە تەرازوو (ی کردەوەکان)، خۆشەویستن لە لای ڕەحمان (واتە: خوا)، کە بریتین لە: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ)، واتە: پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ خوای گەورەو مەزن.

---

لأمه ان زوجته هي سيدة البيت والمؤتمنة على رعاية من في البيت كما كانت الام في شبابها وأنها أي الأم مصونة الكرامة مستجابة الطلبات مخدومة عزيزة ولكن المسؤولة في البيت هي الزوجة بنص قول النبي ﷺ.أي أنها مديرة شؤون البيت والراعية لها، والله تعالى أعلم.

(١) خاتمة الكتاب: نصيحة القارئ بالإكثار من ذكر الله وحمده وتسبيحه.

(٢) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، صحيح البُخَارِي ح ٦٠٤٣)، (صحيح مُسْلِم ح ٧٠٢١).

## پاشکۆی پەرتووکی نوێژ

### دەربارەی سوجدەی لە بیرچوون (السهو)

فەرمووده هاتوون دەربارەی ئەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ سوجدەی سەهوی بردوە پێش سەلام دانەوەو دوای سەلام دانەوەش، بۆیە هەردووکیان دروستن، لەبەر ئەوەشە پێشەوا نەوەوەی لە (المجموع)دا دەیهێنێ لە ماوەردی شافیعی خاوەنی کتێبی (الحاوی) دەڵێ: ڕاجیایی نیە لە نێوان زایانی شەرعزان، واتە: هەموو زانایان لەسەر ئەوەی سوجدەی سەهو دروستە پێش یان دوای سەلام دانەوە، بەڵکو ڕاجیان لەسەر سوننەت بوونی.. لەوبارەوە ئەم دەقە دێنین:

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدريِّ ﷺ، إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ, فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى أَثَلَاثًا أَوْ أَرْبَعًا؟ فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ, ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ , فَإِنْ كَانَ صَلَّى خَمْساً شَفَعْنَ لَهُ صَلَاتَهُ, وَإِنْ كَانَ صَلَّى تَمَامًا كَانَتَا تَرْغِيمًا لِلشَّيْطَانِ}[1].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە کەوتە گومانەوە لە ناو نوێژەکەی نەیزانی سێ یان چوار (ڕکاتی) کردوە، با گومان وەلا بنێت و بونیاد لەسەر دڵنیایی بنێت، پاشان دوو سوجدە دەبات پێش سەلام دانەوە، جا ئەگەر پێنج ڕکاتی کردبوو، ئەو دوو سوجدەیە جێگای ڕکاتێکی بۆ دەگرنەوەو نوێژەکەی دەکەن بە جووت، وە ئەگەر چوار ڕکاتی کردبوو ئەوە ئەو دوو سوجدەیە دەبێتە مایەی گەڕانەوەی شەیتان بە زەبوونی.

---

(١) صحيح مسلم ح٥٧١.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِحْدَى صَلاَتَيِ الْعَشِيِّ، - إِمَّا الظّهر وإِمَّا العَصْر- فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَتَى جِذْعًا فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ فَاسْتَنَدَ إِلَيْهَا، وَخَرَجَ سَرَعَانُ النَّاسِ، فَقَامَ ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقُصِرَتِ الصَّلاَةُ أَمْ نَسِيتَ فَنَظَرَ النَّبِيُّ ﷺ يَمِينًا وَشِمَالاً، فَقَالَ: «مَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ»؟ قَالُوا صَدَقَ لَمْ تُصَلِّ إِلاَّ رَكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَسَلَّمَ ثُمَّ كَبَّرَ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَفَعَ، ثُمَّ كَبَّرَ، وَسَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَرَفَعَ}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێک لە نوێژەکانی (دانی ئێوارەی کرد، یان نیوەڕۆ بوو، یان عەصر، لە دوو ڕکات سەلامی دایەوە، چوو بۆ لای دارێک کە لە ڕووگەی مزگەوت بوو، دەستی پێیەوە گرت، بە پەلە لە ناو خەڵکی دەرچوو، (ذُو الْيَدَيْنِ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە، یان لە بیرت چووە؟ پێغەمبەر ﷺ، تەماشای لای ڕاست و چەپی کرد، فەرمووی: (ئەوەی خاوەن دوو دەستەکە چی دەڵێ؟) وتیان: بەڵێ، ڕاست دەکات، تەنها دوو ڕکات نوێژت کرد، بۆیە دوو ڕکات نوێژی تری کرد، پاشان سەلامی دایەوە، پاشان تەکبیری کرد و سوجدەی برد، پاشان تەکبیری کردو سەری بەرز کردەوە، پاشان تەکبیری کرد پاشان سوجدەی برد، پاشان تەکبیری کردو سەری بەرز کردەوە.**

---

(١) أخرجه البخاري ح ٤٦٨، ومسلم ح ١٣١٦.

## پاشکۆی پەرتووکی حەج



{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنَ الْمَنَازِلِ، وَلأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، فَهُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِنَّ لِمَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ فَمُهَلُّهُ مِنْ أَهْلِهِ، وَكَذَاكَ، حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا}(١).

**واتە: ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنی ئیحرام بەستنی دانا بۆ خەڵکی مەدینە لە (ذَا الْحُلَيْفَةِ)، وە بۆ خەڵکی شام لە (الْجُحْفَةَ) وە بۆ خەڵکی نەجد (قَرْنَ الْمَنَازِلِ)، وە بۆ خەڵکی یەمەن (يَلَمْلَمَ)، وە فەرمووی: ئەم جێگایانە بۆ خەڵکی ئەو شوێنانەیە، هەروەها بۆ ئەو کەسانەیە کە بەم جێگایانە تێدەپەڕن و مەبەستیان حەج و عومرەیە، هەر کەسێکیش شوێنەکەی لە نێوان مەکەو جێگەی دیاری کراو بێت، ئەوە لە ماڵی خۆی ئیحرام دەبەستێت.**

{رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ فِي سننه (ح١٧٣٩)، وَالنَّسَائِيّ (ح٢٦٥٥) مِنْطَرِقِ أَفْلَحبن حُمَيْدٍ عَنِ الْقَاسِمِ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَقَّتَ لِأَهْلِ اَلْعِرَاقِ ذَاتَ عِرْقٍ}(٢).

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی عیراق (ذات عرق)ی دانا وەک شوێنی ئیحرام بەستن.**

---

(١) أخرجه البخاري في: ٢٥ كتاب الحج: ٩ باب مهل أهل الشام، ح١٤٥٤.

(٢) وذكر الحافظ الذهبي في ميزان الإعتدال هذا الحديث عندما ترجم لأفلح بن حُميد وقال هو صحيح غريب، انتهى كلام الذهبي. قلت (البرزنجي): إسناده صحيح وغرابته لانفراد أفلح به وهو ثقة ولحديثه هذا شواهد متعددة والله تعالى أعلم.

## پاشکۆی پەرتووکی هاوسەرگیری

ئەگەر باوک کچەکەی بە شوو بدات، کچەکەش پێی ناخۆش بێت، ئەوە نیکاحەکەی هەڵوەشاوەتەوە

{عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ ثَيِّبٌ، فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَرَدَّ نِكَاحَهُ}[١].

واتە: خەنسائی کچی خیزام خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، باوکی بە شووی داو ئەو بێوەژن بوو، ئەویش پێ ناخۆش بوو، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش مارەییەکەی هەڵوەشاندەوە.

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ جَارِيَةً بِكْرًا أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَتْ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ، فَخَيَّرَهَا النَّبِيّ ﷺ}[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کچێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ باسی کرد کە باوکی بە شووی داوەو، ئەویش پێی ناخۆشە (هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسە بکات، باوکی پێیداوە) پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کرد (دەتەوێ بەردەوامبە، ناتەوێ هەڵیدەوەشێنینەوە).

---

(١) صحيح البخاري كتاب النكاح ح٤٨٤٥.

(٢) أخرجه أبو داود ح٢٠٩٦.

## دەسەڵاتدار نوێنەری خەڵکە بۆ چەسپاندنی دادگەری

{مِنْ حَديث بريدة الْحَصِيبِ الأَسْلَمِيُّ ﷺ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إذَا بَعَثَ أمِيراً، أَوْ سَرِيَّةً دَعَاهُ فأوْصَاهُ... الحديث وفيه ...: «وإذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فأرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لهمْ ذِمَّةَ اللّهِ، وَذِمَّةَ نَبِيِّهِ، فلا تَجْعَلْ لهمْ ذِمَّةَ اللّهِ، وَلاَ ذِمَّةَ نَبِيِّهِ، وَلَكِنِ اجْعَلْ لهمْ ذِمَّتَكَ وَذِمَّةَ أَصْحَابِكَ، فإنَّكُمْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَمَكُمْ وَذِمَمَ أَصْحَابِكُمْ أَهْوَنُ مِن أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اللّهِ وَذِمَّةَ رَسولِهِ، وإذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فأرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ على حُكْمِ اللّهِ، فَلاَ تُنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِ اللّهِ، وَلَكِنْ أَنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِكَ، فإنَّكَ لا تَدْرِي أَتُصِيبُ حُكْمَ اللّهِ فيهم أَمْ لَا..}[1]

**واتە: لە فەرموودەی بورەیدەی حەصیب ئەسلەمی ﷺ (هاتوە)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک ئەمیرێکی دەنارد، یان سوپایەک بانگهێشتی دەکردو ئامۆژگاری دەکرد، (لە فەرموودەکە هاتوە)، دەیفەرموو: وە ئەگەر گەمارۆیی قەڵایەکتدا، ئەوانیش داوای ئەمانیان کرد بە حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەوە ئەمانیان پێمەدە بە حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی، بەڵکو ئەمانی خۆت و هاوەڵەکانتیان پێبدە، چونکە ئەگەر پەیمانی خۆت و هاوەڵەکانتان بشکێنن سوکترە لەسەرتان، لەوەی پەیمانی خواو پێغەمبەرەکەی بشکێنن، هەروەها ئەگەر گەمارۆیی قەڵایەکتدا، داوایان کرد حوکمی خوایان بەسەردا بچەسپێنی، لەسەر حوکمی خوا دایان مەبەزێنە، بەڵکو لەسەر حوکمی خۆت دەیانبەزێنە، چونکە تۆ نازانی حوکمی خوایان بەسەردا دەپێکی یان ناپێکی.**

---

(١) (صحيح مسلم ح ١٧٣١).

ڕوونکردنەوە: زانایانی ئیسلام ئەم فەرموودەو وێنەی ئەم فەرموودەیان لێکداتەوە: کە خاوەن دەسەڵات نوێنەری خەڵکە، وە حوکم بۆ سەپاندنی دادگەریی دەکات، بۆیە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: ئەی دەسەلآتداران، ئێوە کاتێک حوکم دەکەن و بڕیار دەدەن، مەڵێن: ئێمە ئەمە بە ناوی خوا دەکەین، وە سێبەری خواین لەسەر زەوی، نەخێر، بەڵکو مسوڵمانێکی خاوەن دەسەڵاتە و بڕیارەکانیشیان بە ڕاوێژکاریی دەرکردوە، جا ڕاستی و ناڕاستی بڕیارەکانیان بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، نەک خواو پێغەمبەر ﷺ.

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِيْن





## نـــاوەڕۆك

ڕوونکردنەوە: زانایانی ئیسلام ئەم فەرموودەو وێنەی ئەم فەرموودەیان لێکداتەوە: کە خاوەن دەسەڵات نوێنەری خەڵکە، وە حوکم بۆ سەپاندنی دادگەریی دەکات، بۆیە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: ئەی دەسەلآتداران، ئێوە کاتێک حوکم دەکەن و بڕیار دەدەن، مەڵێن: ئێمە ئەمە بە ناوی خوا دەکەین، وە سێبەری خواین لەسەر زەوی، نەخێر، بەڵکو مسوڵمانێکی خاوەن دەسەڵاتە و بڕیارەکانیشیان بە ڕاوێژکاریی دەرکردوە، جا ڕاستی و ناڕاستی بڕیارەکانیان بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، نەک خواو پێغەمبەر ﷺ.

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِيْنَ





## نــــاوەڕۆك

١٥٠

فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پارێزگاری لێکردن و کار پێکردنی لە کردەوە هەرە باش و گرنگەکانە، وە لە بەڕێزترین و گەورەترینی عیبادەتەکانە، جگە لە فەرزەکان، ئەو کەسەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەکات و لە ماناکەی تێدەگات و لە نێو خەڵك بڵاوی دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا، فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ غيره».

لەم فەرموودە دووعا کردن هەیە، یان هەواڵدان هەیە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی حاڵی ئەو کەسەی هەوڵی پاراستن و بڵاو کردنەوەی فەرموودە دەدات.

دیارە تێگەیشتن لە ئایین لە ڕێگەی تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتەوە دەبێ، وە تێگەیشتن لە سوننەت لە ڕێی شرۆڤەو شیکردنەوەی زانایان دەبێ، هەر کەس ئەمەی کرد نیشانەی ئەوەیە خوا ویستی خێری بۆی هەیە.


کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

▪ 07504671394 - 07824671394
▪ فەیس بووك : کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
▪ هەولێر - بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

DESIGN
07504808081